# کاروان


کۆڤارێکی ڕۆشنبیری ی مانگانەیە

ئەمیندارێتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان

بەزمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا

ئازاری 1984 **18** ساڵی دووەم




## لەم ژمارەیەدا




ئەدرەس : هەولێر - ئەمیندارێتی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان - گۆڤاری (کاروان) - ٥ : [illegible]

# توفیق وەهبی

## کوڕی پیرەمەگروون

کەمال ڕەئووف محەممەد

شێخەکەی گڵەزەردە[1] ، شایەتە کە ڕۆژی - یەکشەممە - 15 / 1 / 1984 هەرچەندە ڕۆژێکی سەرەتای چلەی زستان بوو ؛ ڕۆژێکی مێژوویی بوو ، چونکە پیرەمەگروونی دێرین‌و پیرۆز ، وەك سالان ، بەرگی بەفری ماتەمینیی نەپۆشی بوو .. نەوجووان‌و پیرەکانی کوردستان‌و سلێمانیی گەرەکی ؛ وەك پڵنگ بەچیادا هەڵدەگەڕان .. دڵگەرم ، یەكبوون : بەلیدانی دل ، بەهەناسە ، بەتەماشا ، بەبڕوا .

دیارە پەنهانی‌یێك هەبوو ! تۆ بڵێیت خەم بووبێت ؟ من باوەڕ ناکەم ، بەڵکو دەڵێم ؛ هەموو لەئاهەنگێکدا بوون - کە بۆنی هەزاران ساڵی پێشووی لێدەهات - بۆ ناشتن نا ، بۆ پێشوازیی پرشنگێکی ڕۆژی پێشکەوتن کە هاتەوە لای - باپیرە گەورەی -کە چەند ساڵ بوو ، بەجەستە ، نەك بەگیان ، لانەواز بوو .

من ، هەرگیز - باجەستەیشم لەچنگی هەژدەهاکدا بێت کە لەو ئاهەنگەیشی کردم - بیرم تووانای بڕوای نیە کە « ڕووناکی » دەکوژێتەوە ، چونکە ئەوەتا ، پیرەمەگروون هەر لەشوێنی خۆیدایەو سەرکەشە . کاروانی ڕۆڵە دڵسۆزەکانیشی ، ئازاو زاناکانی هەر ڕێچکە دەبەستێت کە توفیق وەهبی -یش مەردیکی ئەو کاروانە گەورەو بەهێزەیە .

توفیق وەهبی ، کە نزیك سێ چارەکە سەدەییکە ، بە بەهرەی گیانی ، کێوی قافی مێژوو هەڵدەکوڵێت‌و لێی دەنووسێت « ئێمە کورد زمانی پیرەمەگرونین » ئەو - تەوفیقە - بەوەش نەوەستا ، بەڵکو کە ڕۆژی 15 / 1 / 1984 لە - لەندەن‌دا - دڵی جەستەی لەگیانەلادا بوو ، بە دووا هەناسەیشی دووا ووشەیی نووسیی کە وەسییەتی کرد ؛ بچێتەوە ئامێزی « پیرەمەگروون » .

ئا ئەو یەك بوونە ، بەو بەرزی‌یەوە ، بەرامبەر بەڕۆژ ، بەڕاستیی « نەمرێتی‌یە » .. خۆزگەم بەخۆی .

—1—

هەڵەییکی دیارە بڵێین ؛ دووای جەنگی جیهانگیریی یەکەم ڕاپەڕینی ڕۆشنبیریی کوردیی دەستی پێکردووە . ڕاست ئەوەیە ؛ کە ئەو - مەودایە - درێژەی ڕاپەڕینە

نەتەوەیی یە تەواوەکەیە کەپاش دەوری مەشروتی ییەتی[3] تورك ( = 1908 ) دەستی پێکردووە ، نەك هەر لەلای کوردەکان ، بەڵکو لەلای عەرەبەکانیش .

پیرەمێردی شاعیرو دنیا دیدە ، لە 1932 دا[3] ئەوەمان دەخاتەوە بەرچاو کە دەڵێت : ( .. کە ئەوان گوتیان ؛ ئێمە تورکین ، ئەوسا هەموو میللەتەکانی‌تر ، سێ چەندانەی ئەوان بوون ، ئەوانیش گوتیان : کەوابێ ئێمەیش عارەبین ، یا کوردین ، یا فلانین .. ئینجا ئەو سەردەمە ، کوردیش کەوتە خۆی . لەئەستەموولاو لەهەموو لایێکدا ، کۆمەڵ کۆمەڵ کەوتنەیەك « لەلاییك / ك . ر . م » لە شوێن ڕیشەو کردەوەو پیشەی باوو باپیری خۆیان گەڕان « لەلاییکی ترەوە / ك . ر . م » لەهەموو کتێبە یاداشتەکانی ئەورووپادا ، هەر شتێکی دۆزییەوە ووتی ؛ کورد ئەمەیە . )

هەڵبەتە ـ بەمەدا ـ دیارە کە بزووتنەوەکە گشتی ی بووە کە سەرئەنجام ، یەکەم کۆمەڵەی سیاسی ی کورد « کورد تەعاون‌و تەرەقی » و ڕۆژنامەکەیشی ـ بەوناوەوە ـ لەپاش شوڕشی 1908 ی بنەماڵەی شەمزین‌و بەدرخان ، دامەزرا . ئەمجا کۆمەڵی « هێڤی ـ 1910 ئەستەموول » و گۆڤاری « ڕوژ کُرد ـ 1913 ئەستەموول » و گۆڤاری « بانگ‌کُرد 1914بەغدا »و گۆڤاری« یەك‌بوون ـ 1915 حەڵەب » و گۆڤاری « ژین ـ 1918 ئەستەموول » .

ئەو ڕاپەڕینە ڕۆشنبیری یە ـ وەك ڕاپەڕینی عارەبەکان ـ کە بەرەگ‌و ڕیشەوە ـ با هەر دەم ئاشکراش نەبووبێت ـ بەسترا بوو بەڕاپەڕینی سیاسی یەوە ، بەکۆمەڵەکان‌و چاپەمەنی ییکانەوە بە گەرمییەوە وەك یەکەم ڕۆژنامەی کوردی ی « کردستان ـ 1898 : قاهیرە ← ژنێڤ » بانگیان دەدا بۆ ڕاپەڕینی « خوێندەواری ی » یان بەواتاییکی‌تر ، وەك « ڕوژکرُد » گوتوویەتی : « بەری شیر قەڵەم[4] » .

قەڵەم کە بیر دەبیزوێنێت ، لە چ بارێکدا بوو ؟ کوردستان ، سەرانسەری ، ژێر دەستەیی ستەمی دەوڵەتی عوسمانی ی یان ئێرانی ی بوو کە لەلاییك ڕوشنبرییشیان کارێکی چەوساندنەوەی دەگێڕاو « زمانی کوردی ی » نووسینی باو نەبوو ، گوایە « کوردلردە لسان رسمی یوقدر = کورد زمانی ڕەسمی ی نیە ! » یان « کوردی ی لەهجەییکی فارسی یە ! » لەولاوەش میللەتەکە نەخوێندەوار بوو .



ڕاستی ییکەی بزووتنەوە ڕۆشنبیری ییکە دەبوو ـ وەك وایش بوو ـ چاو ببڕێتە دوو ئامانجی گەورە :

یەکەم ـ نووسین بە کوردی ی‌و کۆشش بۆ دانانی دەستوورو فەرهەنگ بۆ زمانی کوردیی ، بۆ بڵاو بوونەوەی خوێندەواری ییکی نوێ .

دووەم ـ بووژاندنەوەی ـ هەموو ڕووییکی ـ مێژوو ، کردەوە ، خووو نەریت ، بۆ ووریا بوونەوەو خۆناسینەوەییکی نوێ .

ئەمە ئاسان بوو ؟ کە کێشەی گەورە گەورە بەبەرچاوی بزووتنەوە ڕۆشنبیری ییکەو خەڵکەکەشە وە بوو .. ئەو سەردەمە دوو دەستە سەرمایە بوون ؛ یەکەمیان : مەلا ڕۆشنبیرەکانی دەستەمۆی ڕۆشنبیری ی کۆنی چەند سەد ساڵە . دووەمیان : لاوە ڕۆشنبیرەکانی دەرچووی قوتابخانە



عوسمانییێکان . یەکەمیان جێگاییێکی سەختی هەبوو . دووەمیشیان ـ شپرزە ـ نەیدەزانی ـ لەنووکەوە ـ بۆ قۆناغێکی نوێو ناسك ، چۆن ڕێنووسێکی کوردیی بگرێت ، تاوێك ڕێنووسی دەستەی یەکەمی گرت ، تاوێکیش پەلی دەکوتا بۆ داهێنان ـ وەك نیشاندانی پیتەکانی : ڕوژکرد[5] ـ و بانگی بۆ ڕێنووس ـ یان لاسایی کردنەوەی ڕێنووسی « لاتینی » ی کەباسی دێت : کەئەمەی دووایی بۆ خەڵکەکە بارێکی گران بوو .!

لە گەرمەی ئەو باخی هیوایەدا ، جەنگی جیهانگیریی یەکەم هەڵگیرساو سێ بەشی کوردستانی گرتەوە کە زیاد لە نیو ملیۆن[6] شەهیدی داو سەر ئەنجامیش برسییەتیو نەخۆشییو بێ دەرامەتیی دەستگیر بوو ، لەسەرئەوکارەساتانەشەوە ، هەژدەهاکێکی تری لێ هار بوو کە ئینگلیزو سیاسەتە گڵاوە تاوانبارەکەی بوو . تۆوە کوردی ئەو باخە ، دووای ئەو جەنگە شوومە ، لە کوردستان ـ ی عێراقدا ، لە 1919 ەوە کەوتەوە پەلاماری ڕۆشنبیرانە ، بەلام دیسان کێشەی ڕێنووسو دەستوورو فەرهەنگی زمانی کوردیی لەسەری ڕێگادایە ، بەربەرەکانیش لە بەرامبەرە . هەڵبەت دەبوو چارەییێك بدۆزرێتەوە !. لە 1920 دا ـ بەشی زۆری ڕۆشنبیرە دووەمەکە هاتبووەوە ـ کە ئینگلیزەکان ڕۆژنامەی « پێشکوتن ـ سلێمانی [7] » ی دامەزراند . ئەو دەستە دووەمە کەوتەوە خۆی ـ بەهاریکاریی هەندێك هوشیاری یەکەم دەستە ـ و بە ڕێنووسی جاران ، بەلام بەکوردیی ، کەوتنە نووسین ، تەنانەت داهێنانی نووسینی پەتییو بڵاو کردنەوەی پەخشان[8] ـ بە گوتارو هەواڵو چیرۆکی وەرگێڕاوو[9] بەسەرهاتی مێژوویی کوردو[10] لێکۆڵینەوەی گیروگرفتەکانی کشتوکاڵو کۆمەلایەتی ـ و شیعریش[11] ، ئەمە جگە لە باسی هاندانی جەماوەر بۆ خوێندەواریی .

بۆ ئێرە ، دوو بانگی ڕۆشنبیریی گەورە ، لەنێویاندا کاریگەر بوو :

یەکەم : بانگ بۆ دانانی ئەلفبای کوردیی . کە بەڵگەش گوتارەکەی 24 ی شوباتی 1921 ی : م . نورییە ( = شێخ نووری شێخ سالح ) کە دەڵێت : « ئەم حەرفانە لە کوردیا لەهەنێ جێگادا پێویستە بگۆڕێت . بۆ خاطر ئەمە چاكو باش بخوێنرێنەوە تکا لە بیردارەکانو قەڵەم بەدەستەکان ئەکەم کە بۆ ئەم حەرفانە عەلاماتێکی فاریقە ، یەعنی نیشانەی جوێ بوونەوە بدۆزنەوە ![12] » ، کە ئەمەیش شێوەییێکی بانگەوازەکانی دووای 1908 بوو . جگە لەو وێنەیەش ، بە یادی (1920) ەوە گۆڤاری دیاریێ کوردستان ـ 1925 [13] ، وێنەییێکی ترمان دەخاتە بەرچاو کە دەڵێت : ( مێجەر سۆن تەصەورو دەرسێکی مەخصوصی بە ناوی کوردیی بە حەرفی لاتینی نووسین خستبووە مەکتەبەکانی ئەم ناوە . ئێستایش کتێبێکی مەطبوعی ئوصولو تەعلیمو قیرائەتی ئەم دەرسە ماوە کە محمد زکی افندی بەدبەختو محمد بشکە « باشقە / ك . ر . م » افندی نووسیویانە[14] ) .

ڕاستییێکەی ، کێشەیی ڕێنووس ، دوو دەستەی وورِیای لێبووەوە . یەکەمیان ـ گەرچی لە دووەمیش نەپچڕا بوو ـ لایێنی کوردیی نووسین ـ ی بەلاتینیی دەگرت ، وەك : توفیق وەهبی ، حقی شاوەیس [15] ـ لە سەرەتادا ـ ئەمجا پیرەمێردو[16] چەندیتر . دووەمیان ـ لایێنی ڕێنووسی کۆنو دەستکاری کراوی دەگرت ، وەك : مەعرووف جیاووگو[17] گەلێکیتر .

دووەم : بانگ بۆ لە بیر نەچوونەوەی زمانی خۆمانو خوێندن کردن بە کوردییو بەرپەرچدانەوەی ئەو هاوارە گڕانەی کەدیسان ـ لەو (1921) ە بەدوواوە ـ بەئاشکرا دەدرا بۆ نەخوێندنی زمانی کوردیی لەقوتابخانەکاندا کە بەپەنجە دەژمێردران . بەڵگەی دیاریش بۆ ئەو هاوارە ـ بەپشتی کۆنە پەرستەکانی ئێرە[18] ـ قسەی بڵاوکراوەی (سلیم حسون افندی ـ مفتش منطقەی موصل : ڕۆژنامەی « العراق ـ ژ 251 ـ 23 تشرین ثانی 1921 [19] ) ە کە ڕۆشنبیرەکانی کوردستان ، دەمو دەست لێی ڕاپەریی بوون ، وەك یەکەمەکەیان : ( ڕەسووڵ ناجی ـ کویسنجق . 1921 [20] ) .

ئا لەو ڕۆژگارەوە دەردەکەوێت کە چ ڕێنووس چ خوێندن بەکوردیی ، پێویستییێکی مێژوویی بوون . بەلام بۆ ئەوە کە دوور نەکەوینەوە ، چاکە بپرسین : ئایا ڕێنووس بە بێ دانانی



دەستووری زمان کەڵك دەگرێت ؟ بەتایبەت کە ڕێنووس شایانی گۆڕین و پێشکەوتنە ، بەلام دەستوور ، دەستوورە .

لە پاش دامەزراندنی حکومەتی عیراق ، لەلایێك هەروەها دامەزراندنی ئەنجوومەنی مەعاریف و دروست بوونی کۆمەڵی زانستیی کوردانی سلیمانی و کۆمەڵی بژاری کوردیی « 1925 — 1926 » دەبوو دەستووری زمان دابنرێت . بۆ ئەم ئامانجە ، پیرو لاوێك ، دوو کەسی بنچینە جودا ، هاتنە مەیدانەوە : مەلا سەعید صدقی کابان و ئەفسەر توفیق وەهبی .

ئەو دوو دەستوورەش هەتا ساڵانی 1928 — 1929 ئەمجا چاویان هەڵهێنا ، بەلام چۆن چۆنی ؟

یەکەمیان : موختەصەری صەرف و نەحوی کوردی - مەلا سەعید صدقیی موعەللیمی مەکتەبی ئەووەڵ کە ئەنجوومەنی مەعاریفی سلێمانی لە چووارەم کۆبوونەوەیدا : 1926 / 2/ 11 بڕیاری پەسەند کردنیدا ، هەروەها چاپ کردنی و بڵاو بوونەوەیشی لە قوتابخانەکاندا . دووەمیان : دەستووری زمانی کوردیی - توفیق وەهبی . جیزمی یەکەم - 1929 . بەلام ئەمیان لەقوتابخانەکاندا نەبوو .. ( لە ساڵی 1923 دا وەزارەتی مەعاریفی عیراق ، بەنامەیێکی ڕەسمیی ڕایسپاردم کە دەستووری زمانی کوردیی دابنێم ، تا لەقوتابخانە کوردییێکاندا بخوێندرێت . کە دەستم بەکار کرد ، بەرەو ڕووی ناتووانایی پیتە عەرەبییێکان بووم بەرامبەر دەنگەو بزوێنەکانی نێو زمانی کوردیی کەئەمەم چاوەڕێ دەکرد . لەبەر ئەوە کەوتمە کۆڵینەوەی « فۆنیمات » یا « کۆمەڵە دەنگەکان » ی کوردیی و نیشانە کردنیان بەقەدەر پێویست ، لەگەڵ نیشانە پەیدا کردن بۆ پیتە عەرەبییێکان تا توانای بەکارهێنانیان لە خوێندنەوەو نووسینی کوردییدا هەبێت .

کاتێك دەنگەکە بڵاوبووەوە کە پیتەکانی عەرەبیی نیشانەیان بۆ دانراوە ، لای وەزارەتی مەعاریف قیامەت هەڵسا .. و دانانی ئەو نیشانانەی لەسەر پیتەکانی قورئان بە کفر زانی و کەس و کاری منداڵانی کوردی ئاگادار کردو بەو جۆرە وەزارەتی مەعاریف ئەو دەستوورەی پەسەند نەکرد کە کەس نە لە کورددا نە لە بێگانەدا نەیان توانیوە هاوجۆری دابنێن . لەبریی ئەمەش کتێبی - قەواعید - یێکی تر پەسەندکرا کە لەم چەرخەدا شایانی خوێندن نیە . ) .

زمانەوانەکانی ئەم ڕۆژگارە ، لەگەڵ ستاییشی ئێمەو ئەوان بۆ مامۆستا کابان سەعید صدقی ، بەسەنگی زانستی زمان - هەموویان - ڕابەریی دەستوورەکەی توفیق وەهبیی باس دەکەن . ئێمە لەوە ناکۆڵینەوە ، بەلام ، لەو ڕۆژگارە دەکۆڵینەوە کە ئەو دەستوورە چاپکراو لەقوتابخانەکاندا جێگای نەبووەوە .. ئایا ئیتر لەلای مامۆستاو نووسەران و ڕۆژنامەی ئەو ڕۆژگارەش ئەوها تەماشا کرا ؟

وەلامی تۆمار - بۆ وێنە - بەم جۆرەیە : -

1 — ڕۆژنامەی : ژیان[28] - 22 مایس 1930 بە دەم باسی ژیانی سەعادەتی وەهبی بەگەوە دەڵێت : « دائیما ئارەزووی خدمەت کردنی میللەتەکەی بووە وەگرامێری کوردیی کە هەتا ئێستا بە سوورەتێکی باش نەکرابو و میللەتەکە زۆر ئیحتیاجی پێ بوو ، لە لایەن مەشارو ئیلیەوە ڕێك خراوەو ئەم گرامێرە ئەمەندە باش و چاك کراوە کە لەلایەن هەموو موتەخەسیس عیلمی گرامێرەوە لەهەموو لایێکەوە مەزهەری تەقدیرو تەحسین بووە . وە بە سەبەب ئەم گرامێرەوە موشکیلاتێکی نووسین وە خوێندن لە زوبانی کوردیا نەماوەو ئەتووانین بڵێین بە سەبەب ئەم گرامێرەوە زوبانی کوردیی زۆر سەهل بووەو هەموو منالێك ئەتووانێ بە موددەتێکی زۆر کەم فێری نووسین و خوێندنی کوردیی ببێ . ( تێبینی : هەمان ژمارە دەڵێت : ئیملای تازە . ئەمانەوێ ئیتر غەزەتەکەمان لەسەر ئیملاو گرامێرە تازەکەی جەنابی توفیق وەهبی بەگ بنووسین . بەلام لەبەر ئەوەی لەچاپخانەکەمانا بەعزێ حرووفات نیە کە

پێویستی‌یەتی ، ناتووانین ڕێکی خەین . ئومید ئەکەین بەرە بەرە بە تەواوی تەتبیقی بکەین .

2 – ژیان ـ 29 مایس 1930 بە ناونیشانی « لەسەمای مەعاریفا ئەستێرەیێکی گەش » نووسیوییەتی : ئەمجارە لە لایەن ئەحمە فەندیی عەیزا غاوە لەسەر گرامێرەکەی توفیق وەهبی بەگ ، قیرائەتێکی « ئەلفبای کوردی » ی ڕێک خراوە وە بەم نزیکانە لە لایەنی خۆیەوە لە مەکتەبی ئوممی‌ییێکان دەس ئەکرێ بە وتنەوەی . ئەم ئوسوولە ئوسوولێکی زۆر باش وە بەکەڵکە وە هەموو کەلیمەییێکی وەکو قسە کردن ئەنووسرێ‌و هیچ کەلیمەییێکی لە کەلیمەییێکی‌تر ناچی‌و مومائیلیە ئەحمەدە فەندیش لە ئوسوولی دەرس گوتنەوەی ئەلفبادا شارەزایی‌ییێکی تەواوو دەستێکی درێژی هەیەو هیوامان هەیە لەموددەتێکی زۆر کەمدا منداڵە نەخوندەوارەکان بێ ئەرك‌و ماندوویێتی‌ی فێری خوێندەواری‌ی ببن .

ئومێد ئەکەین لەسینفە نەخوندەوارەکان لەسەر ئەم « ئەلفا » تازەیە دەرس ببیژرێتەوە چونکی زۆر نەفعی لێ ئەبینرێ‌و بە ئاسانترو بە موددەتێکی کەم فێری خوندن‌و نووسین ئەبن . ئەگەر ئەم « ئەلفبا » و « گرامێرە » کوردییە تازەیە لە مەکتەبە ڕەسمی‌ییێکانیشا تەتبیق بکرێ موحەققەق ئیستیفادەی دوو چەندانە ئەبێ . ئینجا هیوامان وایە وەزارەتی مەعاریفیش ئەم ئوسووڵە داخیلی پرۆگرام بکات‌و لە مەکاتیبی کوردیستانا ئەمر بە تەتبیقی بفەرموویێت . (تێبینی‌ی : هەتا چەند مانگێك ڕۆژنامەکە ـ چەند توواناى بووە ـ پەیڕەوی‌ی ڕێنووسی دەستووری زمانی کوردی‌ی کردووە بەلام پاشان دەستی لێ هەلگرتووە ) .

ئەگەر ئەوانە ـ وێنەیی ـ وەڵامی ئەو ڕۆژگارە بێت ، پەسەندە « دەستوورەکە » خۆی دەنگ بکات ؛ ئایا لەخۆیەوە دروست بووە ؟ لەپێشەکییدا ـ خۆی ـ بیرەکەی دەگێڕێتەوە بۆ سالی 1923 و دەڵێت[30] : « لەکاتی خوێندنی ئینگلیزیدا کە دەزمایەم زۆر بوو ، بەخەیالما هات کەدەستووریکی بیچکۆلەی زمانی کوردیی بنووسمەوە . » . مەوداش هەتا 1929 زۆرە ، بەلام بۆچی ؟ وەلامیش لەلای خۆیەتی‌و دەڵێت[31] : « لەکاتێکدا ، ئەوا خەریکی کۆڵینەوەی زمانی کوردیی‌و نووسینی دەستوورییم ؛ دوو شتی گرنگ ڕووی‌دا کە بەهرەیان دامێ بۆ سەرچاوەی زمانی کوردی‌ی بگەڕێم . یەکەم : لەسالی 1925 دا لە کتێبخانەی حمدی بەگی بابانـدا ، کتێبێکی فەڕەنسییم لە بابەت ـ ڕێزمانی ئاڤێستییەوە ـ دەست کەوت . هەروەها کتێبی ـ لێکۆڵینەوەیی ئیرانی‌ی : دراسات ایرانیه ـ زانینەکانی ئەمانە ڕووناکی‌و یارمەتیان دامێ کە لە ڕەگەزی زمانی کوردی‌ی بگەڕێم . بەلام دۆستێکم کە شارەزاییێکی گەورەیە لە زانستی زمانەکاندا ، ئامۆژگاری‌ی کردم کە ـ ئێستا ـ ئەم ڕێگایە نەگرم‌و چاکتر وایە خەریکی نووسینی دەستووری زمانی کوردی‌ی ببم . لەو پێنج ساڵەدا کە دەستووری زمانی کوردییم نووسییەوە ، وام هاتە پێش چاو ، کە یەکەم جارە زاراوەکانی دەستوور بکەم بەکوردی‌ی‌و توانیشم هەندێکیان بەکوردی‌ی ، لەبری‌ی موفرەداتی بێگانە ، دابنێم . » .

دەستووریش ، هەرگیز بەبێ ڕێنووسێکی پتەو ، یان هەر هیچ نەبێت ، بەبێ ناسینی تەواوەتی‌ی پیت‌و دەنگە کوردی‌ییێکان ، توانا پەیدا ناکات ، یان لاوازە . لەبەر ئەم لایێنە ، دەبوو درێژە بدرێت بە بلاوکردنەوەی ڕێنووسی لاتینی‌ی ، کە بەوە بەشێکی ڕەگەزی زمانی کوردی‌ی هەروەها سیفەتەکانی پیت‌و دەنگە کوردی‌ییێکان ، زیاتر ئاشنا دەکرا . هەر بۆییێکە ، توفیق وەهبی ، ئەم ڕێگایەی بەرنەدا ، هەتا دەڵێت[32] « لە سالی 1933 دا ـ خوندەواری‌ی باو[33] ـ م بلاوکردەوە کە خوێندنەوەی نوێیە ، کە چۆن پیتی لاتینی‌ی لە نووسینی زمانی کوردییدا بەکاربێت . ئەو نامێلکەیە گەنجینەییێك بوو بۆ هەندێك موفرەداتی کوردی‌ی داڕێژراوی من‌و بەپێی دەستووری زمان ، یان بەپێوانەی موفرەداتی کوردی‌ی هەلکەوتوو . »

بەلام نووسین بەلاتینی‌ی کە تا ئەم نزیکانەیش درێژەی هەبوو بۆ ئەوە نەبوو کە بپچڕێین لە نووسین بەپیتی عەرەبی‌ی کەشوێنی مێژوویی خۆی هەیە . بەڵکو بۆ ئەوە بوو ، تەکان بدرێت بە ڕێنووسێکی نوێ‌و داڕشتنی نیشانەی جوداو پەسەند ، بۆ خزمەتی زمانەکەمان کە هی هەمووانە . لەگەلاوێژدا ، خۆی لە 1943 دا زانایانە دەڵێت[34]

، بەرزکردنەوەی زمانەکەمان ، هەر ئەرکی کوردیك نیە ، ەسەر هەموو کوردێکە شانی بداتە ژێری . ئیتر چاوەڕووانی ئارزوو لێ هەڵکردنتانم » . ئەمەیشی لەهەڵێکدا بوو کە بڕیاری تەواوەتی‌دا بوو کە هەر بە پیتی عەرەبی ی بنووسێت . بەلام چۆن ؟

لەچلەکان بەدوواوە ، دەڵێت « [35] بڕیارمدا هەتا پیتی عەرەبی ی نیشانەداری داڕێژراوی خۆم دانەنێم ، هیچ بڵاو نەکەمەوە . هەر بۆ ئەم ئامانجانەش لە 1956 دا چووم بۆ بەیرووت ، سەرپەشتی داڕشتنی پیتی تایبەتی ی بووم ، ئەوی کە ـ قواعد اللغة الكردية ـ م پێ بلاوکردەوە ) . لێرەدا دەبێت ئەو ڕاستی‌یە وون نەبێت ، کە ئەو بازە مێژوویی‌یە ئەوکە دای بەزمانی کوردی ـ لەمێژەوە ـ لاوانی خستبووە سەر ڕێگای کردو کۆشی هونەرمەندانە . بەڵێ بەرابەری ی‌و ئامۆژگاری ی ئەو بوو کە لە (1951 — 1953) ەوە ، ئیبراهیم بالدار[36] . هەروەها بەکر دلێر[37] ( = سەرپەرشتی گۆڤاری : پەیام[38] ، خاوەندی زنجیرەی خوندەواری کوردی ی[39] ) بەڵکو چاپخانەکانی وەك ؛ مەعاریف ، نەجاح ، بیریان کردەوە ، کاریان سەرپێ‌گرت بۆ داهێنانی هەندێك نیشانەی جودا بۆ پیتی عەرەبی ی ـ کوردی ی ، کە ئەمانە تۆمارن‌و هەموویان ناوی چاکەی ئەویان بردووە بۆ خزمەتی ئەو ڕێنووسەی کە لەوە دوواتر ـ 1956 ـ زمانی کوردی ی گەیاندە کەلووی ڕووناکی ی .

هەڵویستەیێك دەکەین ، دەڵێین ؛ ڕێنووس ، دەستوور ، بژاری زمان ، بەڵکو زمان خۆیشی هەموو بۆ خزمەتی مرۆڤە تا لەگەڵ ڕۆژگاری ژیان ڕێك بکەوێت . سەدەی بیستەمیش کە پڕییەتی لە ڕووداوی زانیاری‌و هونەری ی ، پەیوەندی ی بە کوردو زمانی کوردیشەوە هەیە . بایەخ دانیش بەم باسە ، لەپێش هەر کەسێکەوە ئەرکی زمانەوانی وورییە . هەڵبەتە توفیق وەهبی زانا ، کە چاوی لەدەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی‌و دووا نەکەوتنی جەماوەرە بوو لە بزووتنەوەی ژیان ، دەبێت تاو بەکۆششی بدا . ڕاستی‌یێکەی ، لە ڕیزی پیشەوەدایە کە خۆیشی ئەم باسە ئاشکرا دەکات‌و دەڵێت : [40]« لە گوڤاری گەلاوێژدا ـ وابزانم ـ فەرهەنگۆکێکی عەرەبی ی‌و کوردییم بەناوی ـ فەرهەنگی گەلاوێژ[41] ـ ەوە بلاو کردەوە ، کە تەواو نەکرا . لە ساڵی 1942 شدا فەرهەنگێکی کوردی ی ـ عەرەبی ی نزیك دوو هەزار ووشەی کوردی ی پەتی‌و هەڵبژاردەو داڕێژراوی خۆم بڵاو کردەوە . ئەو فەرهەنگەش کەڵکی نووسەرانی کوردی گرت چ جای وەرگێڕەکانی عەرەبی ی بۆ کوردی ی . » ، ئەمە لە هەڵێکدا لە گەلاوێژی 1943 شەوە ، بە تکاوە بانگی دەکرد[42] : « تکا ئەکەم لە خوێنەرەوەکان ، بەرامبەر ئەو ووشە عەرەبییانەی کوردییەکانی ئەنووسین ، ئەگەر ووشەی تری کوردی ی ئەناسن ، بۆمان بنێرن تاکو بڵاوی بکەینەوە ، بۆ ئەمە پیرەکانمان گەنجینەوانی هێژان لێیان کەڵك سین بین . » .

کەوابوو ، ڕێنووس ، دەستوور ، فەرهەنگ ، زنجیرەیێك ئامانج بێت ، ئامانجی هەرە گەورە چیەو بەرەوکوێ ؟

— 2 —

هیوا ، توفیق وەهبی ی کردبوو بە مەلەوانێکی بەتوواناو لێهاتووی نێو دەریای زانستی زمان . لەلایێك تەواو شارەزای زمانی کوردی ی‌و شێوەو بێچووە شێوەکانی بوو . لە لاییکیش تەواو شارەزای زمانی عارەبی‌و زمانی فارسی نوێ‌و تورکی ی‌و دەستووریان‌و شارەزای زمانەکانی ؛ ئینگلیزی ی‌و فەڕەنسی ی‌و دەستووریان‌و دەستووری زمانی ئەڵەمانیشی بوو ، هەروەها خەریکی لێکۆڵینەوەی دەستوورەکانی زمانەکانی هیندو ئێرانی ی‌و سانسکریتی‌و ئاڤێستی‌و فارسی ی کۆن‌و فارسی نێونجی ـ فەهلەوی ـ وئەفغانی‌و بلوژی‌و هەندێك شێوە زمانی تر بوو ، کە لە 1956 دا خۆی ئەمانەی گێڕاوەتەوە .[43] . ئایا ناتووانین بڵێین ؛ ئەمەیەك ـ کوردێك ـ ئاسۆی ڕۆشنیری ی وا ڕوون بێت . کە یەکێکیش ئەوها چلەی چاوبدات‌و بتوێتەوە ، دەبێت ئامانجێکی مەزنی وەك ئامانجی « ئەمین زەکی » کوڕی شەرفنامە بێت‌و کەمتر نەبێت .

خۆی لەگەلاوێژی 1943 دا[44] ، بەناوی «زنجیرە ووتار لەبابەت بنج‌و بناوانی زمانی کوردییەوە » دەمانباتە بەردەم ئەو ئامانجە مەزنە ، کە بەم جۆرەش دەمانبات .. دەڵێت : « ئەو خویندەوارانەی بلاوکردنەوەکانی ئەم دووایییەی زمانی کوردی ی شوێن کەوتوون ، ئەبینن کە ئەو ووشە بێگانانەی لەسەردەمی دوورو نزیکەوە جێگیر بوون لەزمانەکەماندا ، بەرە بەرە جێی خۆیان بەرەڵلا ئەکەن بۆ ووشەی کوردی ی ، وەبەرامبەر بەو ووشە تازانەش کەوا بە پێویستی ی زانست‌و هونەرو پیشەی باوەوە تازە دائەهێنرێن لەگێتیدا ، ووشەی

کوردی‌ی پەتی ، خراوەتە کار ، پڕ بەمانای خۆی . گەنجینەی زمانی کوردی‌ی لە هەموو فەرهەنگێکی زمانەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیك ، پڕ ترە لە گەوهەر . من بیست ساڵێك ئەبێ کە بەچاوێکی پشکنین‌و دەسێکی چنینەوە بەناو ئەم گەنجینەیەدا ئەسووڕیمەوە ، لەپاش ئەوە کە گەلێ لە گەوهەرەکانیم جوێ کردەوەو گەردم سڕین‌و لێکمدانەوەو پەییم بەبنج‌و بنەوانیان برد ، تێگەییشتم کە ئەم گەنجینەیە : کە دەمی خۆی زمانی دینێك بووەو شارستانیەتی‌ی هەرە بەرزی داداوە ، ئەو زمانەیە کە آویستای پێ نووسراوەتەوە .. گەوهەرەکانی ئەم گەنجینەیە کە آویستا چوار هەزارێکیانی بۆ شاردووینەتەوە لە ـ ئێسکە کۆنەکانیدا ـ ئەمڕۆ لەئێسکێکی باویاندا لەژێر دەسمانان ، بەڵام داخم ناچێ ، گەلێکمان وەك دراوێکی لەڕەوا کەوتوو لەکون‌و قوژبندا فڕێ داوەو دەسمان درێژ کردووەتە داڕێژراوی بێگانە .

ئامانجم لەبڵاوکردنەوەی ووتارەکانی ـ بنج‌و بناوانی زمانی کوردی‌ی ـ لەگەلاوێژی خۆشەویستدا ئەوە بوو کە بچینە ناو ئەم گەنجینەیەوە ، وەپێکەوە ، بەشێنەیی تێیدا بسووڕێینەوە ، کەچی لەپاش بڵاوکردنەوەی ووتاری نۆیەم ، وەها ڕێکەوت کە خەریکی هەندێ کاروباری تربم وە بەدەمی‌ی ـ موقتاً ـ دەس لەوان هەڵگرم . بەڵام هەمیشە بەداخەوە دیم‌و ئەبینم کە کوردەکان زمانەکەی خۆیان ئەبەنەوە سەر زمانی پەهلەوی وە بەپەهلەوی‌یەوە ئەنازن . لەبەر ئەوە بە پێویستم زانی ، لە بەرەوە هەندێ زانیار لە بارەی تیرەی زمانەکەمانەوە بڵابکرێتەوە . لە ووتاری چوارەممانا[45] لەباسی دروست بوونی شێوەکانی کوردی‌و باسی ووشەی «کرمانج » دا زانیارییێکی زۆر کورتی بەکەڵکم بڵاو کردبووەو لەبارەی تیرەی زمانی کوردییەوە . پێشانم دابوو کە زمانی کوردی‌ی لە : تیرەی زمانی کۆن ـ پەهلەوی ـ فارسی‌ی تازە نیە !! » .

ئەم ئامانجە مەزنە ، کە خۆیشمان ئاگاداری نەبووبین ، زووتر لەلای بێگانە ، دیار بووە . بەڵگەش ئەم باسەیە کە گەلاوێژی تەمووزی 1940 باسی دەکات‌و دەڵێت[46] : « گۆڤاری : جورنال ئۆف ڕۆیال سانتراڵ ئێژیان سۆسایتی ـ بەقەڵەمی ؛ سی . جەی . ئەدمۆندس C.J.EDMONDS گەلاویژی تەنقید کردووە [ = هەڵسەنگاندووەو لەمەڕ توفیق وەهبی ـ ش گوتوویەتی ] : توفیق وەهبی بەگ کە عالمێکە ، ناوبانگی بڵاو بووەتەوە بۆ ئەورووپا لە زنجیرە ووتارێکی عالیمانەی کە لەبابەت فیلۆلۆژی ـ علم اشتقاقی زمان ـ ئێرانییەوە ، سیانیانی تێدا بڵاو کردووەتەوە . ( = واتا لەسەرەتای گەلاوێژدا : 1939 — 1940 / ك . ر . م ) . لەمەدا ئامانجی تایبەتی‌ی دۆزینەوەی بنج‌و بناوانی زمانی کوردییە ! » .

لێرەدا دەبێت سەرمان لێ تێك نەچێت‌و بزانین کە لەو ڕێگا سەختەدا ـ زمان ـ بەشێکی زانستی ئەنثروپۆلۆژیای[47] ڕۆشنبیری‌ی بووە ، کە توفیق وەهبی لەگەڵ پشت بەستن بە ئەنثروپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی‌ی ، کەڵکی لێ وەرگرتوون . بە واتاییێکی‌تر ، کەڵکی لە زمان ، لە کۆڵینەوە لە بەردە نووسراوێك ، چیاییێکی هەڵکۆڵراو ، نەریت‌و خوو ، ئەفسانە ، داستانی دێرین ، گۆرانیی کۆن وەرگرتووە . دیاریشە کە پەیڕەو کردنی ئەو زانستانە ، دەوور کردنەوەی رووخسارە زۆرەکانی ـ ماددی‌و مەعنەویی ـ سەدەکانی پێش عیساو پێش‌و پاش ئیسلام‌و هەتا ئەمرۆی ویستووە ، هەروەك دەوور کردنەوەی سەدەها بیروڕای زاناکانی : مێژوو ، جەگرافیا ، زمان ، ئەرکیۆلوژیاو یادگاری ڕۆژ هەڵاتناس‌و گەشت وانە بێگانەکان‌و کورد ناسەکانی ویستووە .. ئا بەم توواناییانەوە ، بەزانست ـ نەك بەزۆر ـ ئەو ، وەڵامی ئەو پرسیارە گەورەیەی ـ زیاتر ـ دایەوە کە : کورد کێ‌یە !

ئەو ، بەدەستوورو خوێندەواری باو ـ ـە کەیەوە ، بە گۆڤاری گەلاوێژ ، دەنگی گێتی‌ی تازە ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق‌و کوردو چەندی‌تر ، ئەو درۆو لافە ناڕاستانەی ـ لەوانەشدا ؛ لافەکانی مەکەنزی[48] ـ دایە دوواوەو بۆ بەرەو دووا ساغی کردەوە کە : زمانی کوردی‌ی ـ ئێستا ـ سەر بەفارسی‌ی تازە ـ پەهلەوی ـ نیە، بەڵکو شێوەییێکی مادی نێونجی‌یەو کوردیش = کرمانج ، وەچەی ڕاستی مادەکانە .

لێکۆڵینەوە ئەنثرۆپۆلۆژی‌یێکانی بە ئینگلیزی چ جای بەعارەبیی (ئەشکەوتی گوندۆك[49] ـ 1951 بەئینگلیزیی ، کە لە وێنە هەڵکۆڵراوەکانی ئەشکەوتی گوندۆکی نزیك ئاکرێ دەکۆڵێتەوە ) و (ئەسڵی ناوبردنی شارەزوور ـ 1961[50] بە عارەبیی ـ کەهەتا شەرەفخانی بەتلیسی دەدوێنێت ) و (ئاڵتون کۆپرۆ ـ پردی ئاڵتون[51] ـ 1956 بەعارەبیی ـ کە بە « زێ » دا

هـەڵدەکشێتەوە بـۆ لای ئاوێستـا ) و (قەلاییکی کیـانیی لە ژووروی سلێمـانیدا ـ 1958 بـەعارەبیی[52] ـ کـە قزقـاپـان‌و جوڵندی تـەمەنـدار دەکات ) و ( سـەفەریـك لە دەربەنـدی بازیانەوە بۆ ملەی[53] تاسلۆوجە ـ 1958 بەعارەبیی ـ کە دێرین دەکات ) هەروەها وەرگێرانی (قسنێك لەکوردستانا[54] ـ 1946 لەئینگلیزییەوە بۆ کوردیی ) بۆ ئەو ئامانجەی خستبوونە کارو ئەوانەو لێکۆڵینەوە زانستیی‌یەکانی تری (القصد والاستطراد في اصول[55] معنى بغداد ـ 1950 ) و (بهـرام گور ـ ابعـاد معنى اليحمـور[56] اسـم الملك ـ 1957 ) هـەمـوویـان راسـتـیـی پەیوەندیی‌یەکەیشی بە زانستی ئەنثرۆپۆلۆژیاوە ساغ دەکەنەوە کە زانایەتی .

بـۆ راستیی ئەم بـاوەڕەش ، بـەکـورتیی ، قسـەی شایەتێك دەخەینە بەرچاو کە لە ئینگلیزیی‌یەکەو کوردیی‌یەکەی « ئەشکەوتی گوندوك » دا تۆمارە ، زانا : ستون لیوید Seton Lloyd دەڵێت[57] : « خـاوەن بـەرزیی کـە دەمێکـە خـەریکی لێکۆڵینەوەیە لە ئەنثروپۆلۆژیی کۆمەڵایەتیی‌و ئاثاری کۆنی لیواکانی شیمالی عیراق ، ئیقتیراح ئەکا بۆ ئەوە گوڕینی رمووزو نیشانەکانیان تەقدیر بکرێ . مەقصەدی هـەڵکەنـدراوەکانی لەگـەڵ خـەرافـاتی کـۆن تێکـەڵ کـردووە .. وە ئـەنجـامی لێکۆڵینەوەو لێدووانی بەپێشان‌دان‌و وەصف کـردنی چەنـد نموونەیێـك لە طقووسی دینیی دووایی هێنـاوە کەدڵگیـرن ، چونکە تائێستا ئەبحاثی ئەنثروپۆلۆژیی لەناو کوردەکانـا بە ئەندازەیێکی زۆر نەبووە .. هتد ) .

— 3 —

تـوفیق وەهبی ، ئـەفـەرمـوێت : « لە سـاڵی 1943 دا گۆڤاری دەنگی گێتیی تـازە[58] ـ دامەزرا کـە بەچـاودێریی زمانەوانیی من ، دەردەچوو . ئەم دەمێشت هیچ گوتـارێکی نووسراوی دەستەی نووسەرانی بڵاوبێتەوە هەتاکو لەچاکیی زمانەکەی دڵنیا نـەبوومـایە . هـەندێـك جاریش کـەپێویست دەبـوو ، خۆم چـاکم دەکردن[59] . » . ئـەم فەرمـاییشتەیش راستـە ، لەلایێك ئـەگەر نـووسراوەکـانی گۆڤـارەکە دەوور بکـرێتەوە . لەلایێکی تـرەوە کە شـایەتێکی زینـدووی وەك : حەسەن شێخ حەمە مارف[60] کە نووسەری ئەو گۆڤارە ـ وەك بۆی گێراومەتەوە ـ وابڵێت . تەنانەت دەتووانین بڵێین ـ هەتا چاودێریی زمانەوانیی دەکرد ـ کە ئەو چاودێرییە ، پیشەی هـونەری دروست کـردنی « هەواڵی رۆژنـامە نـووسیی » لە رۆژنامەنووسیی کوردییدا ، لە رووی رەوانیی‌و کورت بـڕیی‌و زمانەوە ، پتەوکرد . لەوە زیـاتر ـ وەك لەهـونەری رۆژنـامە نووسیی‌و رادیۆ . دەکۆڵەوە ـ لام روونە کە ئەو چاودێرییە ، گەییشتووەتە یەکەم رادیۆش ، کەرادیۆی کوردیی بەغدایە . لەسەرو ئەم راستیی‌یەوە راستیی‌یێکی وونیش ئەوەیە ، کە بۆ دامەزراندنی رادیۆی کوردیی بەغدا کە لە 1939 دا حکومەتی عێراق بڕیـاری دامەزرانـدنی‌دا ، لەنێو کـوردا —2— کەس کـاریـان بـۆ پێکـەییشتنی ئـەو بـڕیـارە کـردووە ، کـامـل کاکەمین[61] ـ ی یەکەم کارگێری ئەو رادیۆیە ، لای من قسەی تۆمارەو دەڵێت « وەك ئێمە دەزانین خواڵێخۆش‌بوو ئەمین زەکی بـەگ‌و تـوفیق وەهبی بـەگ پێشـرەوی ئـەم دامـەزرانـدنـە بوون[62] ! » ، زیاتر دەڵێت : « تەرجەمە کردنی دەنگ‌و باس کە لە ئینگلیزییەوە دەکرا بە کوردیی ، لەژێر چاودێریی توفیق وەهبی بەگدا بوو . » . گومانیشی تێدا نیە کـە چەسپـاندنی زمانێکی کوردیی رەوان بۆ رادیۆ ـ کە دەزگایێکی ناسکە بۆ هەموو گوێگرە کوردەکان ـ لەلای ئەو ئەرکی سەرشان بووە . دەشتووانین بڵێین ، کە ئامۆژگاریی‌یەکانی کاری بۆ پێ‌گەیاندنی چەند رۆژنامەنووس هەبووە ، کە یـەکێکیان رۆژنـامەنـووسی وون‌و بەتوانا ، وەرگێری دەنگ‌و باسی رادیۆ ، حەسەن شێخ حەمە مارفە . هەروەها کاری لە عادل جەمال عیرفان‌و[63] بەکر دلێـرو رەفیق چالاکیش[64] کـردووە ، کە لەگـۆڤاری ـ پـەیام‌و رادیۆدا ـ لە پەنجاکاندا کاریان دەکرد . جگە لەمانە ، دەیەها مامۆستاو رۆشنبیرو قوتابیی‌و دۆستانی رۆشنبیریی کوردیی پرس‌و رایان پێ دەکردو لە ساڵی 1956 دا ، یانەی سەرکەوتن ـ ی کوردان لە بەغدادا ، کردیان بە سەرەکی شەرەف‌و ئەویش لەکۆڕەکانییدا چەنـدین گوتـاری زمانـەوانیی‌و لێکۆڵینـەوەی زانستیی بەنرخی پێشکەش دەکرد .

دووڵایێنی تـریش شایـانی سەرنجـە ، کەیـەکـەمیـان راستیی خـزمەت گـوزارییەتی بـەرامبەر بـە « عێـراق » و زانست‌و ئـەدەبی عەرەبیی خـۆی جگە لەوەی کـە لە ساڵی

1921 — 1930 ئەفسەرێکی لەشکری عێراقی بوو ، لە ساڵی 1958 دا سەرۆکی کۆمەڵەی دانان و وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەیی ـ عیراقی بوو ، کە گۆڤاری بەنرخی « الکتاب » ی مانگانەی دەردەکرد . بێجگە لە گوتارە زانستیییەکانی کە بەعەرەبیی بوون ـ باسیان کرا ـ گەورەترین خزمەتی ئەوە بوو کە ؛ هەردوو جزمی « دەستووری زمانی کوردی »[65] » ی خۆی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبیی و وەك خۆی گوتوویەتی « بۆ خزمەتی برا عەرەبەکان[66] » . ئەمە جگە لە شێوازی نووسینی ڕەوان و زانستییانەی بەعەرەبیی و ئاشنا کردنی خوێندەواری عەرەب بەگەلێك ڕاستیی مێژوویی چ جای زمانەوانیی .

وەك ئەم ڕاستییەش نامرێت ، ئەو ڕاستییەش هەروەها کە خزمەتی ڕۆشنبیریی ئینگلیزیی و جیهانی کرد کە بە زمانی ئینگلیزیی گەلێك باسی لەمەڕ ڕۆشنبیریی کۆنی ئەم ناوچەیەو کوردو زمانی کوردیی و شوێنە دێرینەکانی کوردستانی عیراق بڵاوکردەوە . گەورەترین خزمەتیشی بۆ زمانی ئینگلیزیی ( فەرهەنگی : کوردی ـ ئینگلیزی[67] ) یە کە بە هاریکاریی مستر ئەدمۆندس[68] دانراوە .

بێ گومان هەر زانایێك ، هەمیشە ، دەوری کارەکانی بکاتەوە ، بڕیار دەدات کە ئەوانە بەگشتی ، خزمەتی گەورە بووە بۆ زانست و مرۆڤایەتی و بەهەقیانەتیش ، شەرەفی « زانایی » پێبڕاوە ، کە لە پاش خۆیشی ـ چەندین ـ کاری بەنرخ و بڵاو نەکراوەی[69] ، زیاتر مێژوو دڵنیا دەکەن کە کوڕی « پیرە مەگروون » نەمرە .. بەڵێ توفیق وەهبی[70] !.

—4—

پەراوێزێکی مێژوویی ..

لەسەر ڕاپەڕینە نەتەوەیییەکەی جەماوەری سلێمانیی (ناسراوبە : شەڕی بەردەرکی سەرا : 6 ئەیلوول 1930 ) دژی ئینگلیزی داگیرکەرو حکوومەتی نوری سعید ، کتێبی ئەحمەد خواجەی مێژوو نووسی دۆست (چیم دی ـ بەرگی . 3 [71] ) بە گێڕانەوەیێکی ئاڵۆز ، لە لایێکدا دەڵێت کە حکوومەت (بەم بزووتنەوەیە ئاگادار کرا . توفیق وەهبی بەگ برایەوە بۆ بەغدا ـ ل 84) . لە لایێکی تردا ، دەڵێت : (زۆرترینی کوردەکانمان بەگلەیین و ئەڵێن ئەم کوشتارو پەریشانییەی لەشارەکەی خۆیدا ـ سلێمانی ، ڕوویدا ، ئەو تاوانبارە ـ ل 98) کە ئەمانەی بە پەراوێز داناوە بۆ ئەو « بەیان نامە گرنگەی توفیق وەهبی بەگ : ڕۆژنامەی : الراصد ـ بیروت . ع 3766 . 24 آب 1932 » . دیارە مەبەستی مێژوو نووس ئەوەیە کە ئەو ، ـ توفیق وەهبی ـ لە سلێمانییدا بووەو بە بەرچاوی ئەوەوە ، ئەو کارەساتە لە شارەکەی قەوماوە ، کە موخابن هەندێك نەشارەزاش وا دەڵێن !.

ئەو بەیان نامەیە (کە چیم دی ـ بڵاوی کردووەتەوە ) شایانی سەرنجە کە ( خۆپێشاندانی ئاشتی خوازانەی سلێمانی : پەراوێزی ـ د ) بەڕەوا دەزانێت و زیاتر دەڵێت : ( وەزارەتی عیراقیی ڕەفتاری توندو تیژیٔ نا جوامێرانەی بەکار بردو بوو بەهۆی شۆڕشی شێخ مەحموود کە بە نێروویی ئینگلیزو سیاسەتەکەی ، دامردەوە ! » .

لێرەدا ئەم دوو پرسیارە سەر هەڵدەدەن :

1 — ئایا ـ وەهبی بەگ ـ ئەو کاتە موتەصەڕیفی سلێمانیی بووە ؟

2 — تاوانبارێك ، لە بەیرووتەوە پاش 2 ساڵ ڕوودا و ، ئەو بەیان نامەیە بۆچی دەردەکات کە بەتەواوی بەیاننامەکە لەسەر کورد دەکاتەوە ؟

وەڵام بە کورتیی ، بەم جۆرەیە :

1 — ئەنجوومەنی وەزیران لە کۆبوونەوەی 28 نیسان 1930 دا بڕیاریدا « توفیق وهبی بگ ـ آمر المدرسة العسكرية الملكية و دار التدريب » بە موتەصەڕیفی سلێمانی دابنرێت . (نامەی ژمارە : 6241 ی 6 مایس 1930 ی وەزارەتی ناوخۆ وای نیشان داوە کە ئەمەش پاش ـ ئیرادەی مەلەکیی : ژ . 105 ی 30 نیسان 1930) ە ـ .

2 — لە 10/ مایس / 1930 دا لە سلێمانییدا چووەتە سەر فرمانەکەی هەتا (22/ ئاب /1930) . (دۆسیێی کەسی خۆی ـ پارێزگای سلێمانیی ) .

**پاشکۆ**:

(2 بەڵگەنامەی ڕەسمی لە دۆسێی توفیق وەهبییەوە، وەك خۆی)

- «بروسکەیێك وەك چۆن نووسراوە»
لە وەزارەتی داخلیەوە
بۆ مفتش اداری سلیمانی
ژمارە : 11316
روز : 1930/8/21
اعلامتان اکەین إستغنا کرا لە خدماتی متصرف توفیق وهبی بك.

---

دائرەی متصرف لواء سلیمانی
ژمارە : 1825/82
روز : 1930/8/24
بو رؤسای دوائر
اوا صورتی مُترجَمەی تلغرافی وزارەتی داخلیە دائر بە إستغنا کردن لە خدماتی توفیق وهبي بك بو معلومات نیررا.
«ئیمزاییکە بە ئینگلیزی»
وکیلی متصرف سلیمانی

× × ×

2 - (نامەیێکی رەسمی یە بە ئینگلیزی و عارەبی. وەك خۆی بلاوی دەکەینەوە).
وزارة داخلية العراق
العدد 11451
التأريخ 26/25 / آب / 1930
«شعبة الأمور الذاتية»
بناء على الاستغناء عن توفيق وهبي بك متصرف لـواء السليمانية قطعت علاقته من اللواء اعتباراً من 22/ آب /1930 قبل الظهر.
(ئیمزا)
عن وزير الداخلية

**(22)ی ئاب هەتا «6» ئەیلوول «15» رۆژی نێوانە)**
کەوابوو : ئەولێرە نەبووە . تاوانبار نیە !!
بەلگەی گەورەتریش ئەم تۆمارەیە .. روژنامەی ( ژیان : س 5 . ژ 259 . 11 ربیع الآخر 1349 = پینج شەمە 4 ئەیلوول 1930 ؛ واتە14 رۆژ دووای لاچوونی موتەصەڕریف توفیق وەهبی و 2 رۆژ پێش 6 ی ئەیلوول ) : -

1 — سەر گوتاری رۆژنامەکە « موفارەقەتی سەعادەتی توفیق وەهبی بەگ بە تەواوی تەئثیری کردۆتە میللەتەکەمانەوە » : -
رۆیشتنی موتەصەڕریفی غەیوورمان ، سەعادەتی توفیق وەهبی بەگ ، بو بەغدادو [ خەبەری ئینفیصالی ] لە موتەصەڕیفی یەتی ئێرە ، جیددەن زۆر تەئسیری کردە ئەهالێکەمان . بە عومومی کوردەکانی عیراق و بەتایبەتی ئەهالی ئەم لیوایە بەگەورەو پچووك و ژن و پیاوەوە موتەئەثیرەو بۆ ئیعادە کردنەوەی حورمەت کەشن و بۆ هاتنەوەی لە هەموو لایێکەوە ئیستیرحام نامەیان تەقدیمی حکوومەت کردووە .

2 — وەختێ کە (هەمان ژمارە دەڵێت) سەعادەتی موتەصەڕریف توفیق وەهبی بەگ مواصەلەتی بە غدادی کردو غەزەتەکان نووسییان [ ئینفیصالی پێ کراوە ] لە هەموو لایێکەوە ئەهالی ، رونەسای عەشائیر ، بۆ ئیستیرحام ئیعادە کردنەوەی موشارو ئیلیە ئەم تەلغرافانەیان نووسی و تەقدیم کردو قیسمێکی تەلەغرافەکان بەڕیزە نەشر ئەکەین (تەلەغرافەکان بۆ فەخامەتی مەندووبی سامی و فەخامەتی رەئیس ئەلوزراء لە لایەن ئەشرافانی سلێمانی و سەرۆکەکانی عەشاییرەکانی پشدەر ، هەورامان ، لە 20 ، 24 ، 26: 1930/8/ دا لێدراوون . / ك . ر . م) دەڵێن ..
( ..جلب المتصرف الى بغداد استوجب التوحش والهيجان )
یان ( .. گۆڕینی موتەصەڕریف وەهبی بەگ ئەبێ بە سەبەبی تەئثوری عومومی کوردان . رجا ئەکەین - زوو - ئیعادەی بفەرموون ) .
کەوابوو ، لە 8/22 هەتا 9/4 ئەیلول - ی پێش 6 ی ئەیلول ، داوای هاتنەوەی (تێگەیشتووترین و چاکترینی میللەتەکەمان و لە سەر ئەفرازانی عیلم و مەعریفەت کە ئەم وەطەنە پێی گەیاندووە و کە هەموو میللەت بە دڵێکی ڕوون و بێ غەشەوە خۆشی ئەوی و کە یەکانە هەر ئومێدی بەعیلم و عیرفان بووە ، سەعادەتی توفیق وەهبی بەگ - : ژیان . ژ 239 . 19 مایس 1930 . بە بۆنەی هاتنی .) ی کردووە .
هەرگیز هیچ ئاقڵێکیش باوەڕ ناکات کە هەتا (4) ی ئەیلوول لێرە نەبێت ، (6) ی ئەیلوول لێرەبێت .

ڕاستی‌یێکەی ئەوە پەسەندە ، بگەڕێین لەوە بپرسین : « بۆچی ئینفیصالی پێکراو لە 8/22 ەوە لێرە نەما ؟

هەرچەندە ڕووداو زۆرەو هەندێکیان تۆمارەو هەندێکیان نادیارە ، ئێمە دووای 2 ڕووداوی گرنگ دەکەوین کە : زۆر مایەی لابردن و دوور خستنەوی ئەوون :

1 — لە 16 ی تەمووزی 1930 دا [ وەلی عەهد ] تەشریفی هات بۆ سلێمانی ی و لە سەعات : (9) دا ( = نۆی عارەبیی جاران – عەسر ) خۆنیشاندانێکی ؛ سەربەست ، ڕێك و پێك ، ئاسوودە ڕێکخرا بۆ وەرگرتنی مافی میللەت . ( ژیان : س 5 . ژ 252 . 21 تەموز 1930 ئەو باسەی تەواو ڕوون کردووەتەوەو ئەم باسەیش درێژەی هەیە هەتا 10 ی ئابی 1930 . ) .

2 — ڕۆژانی : 8 , 9 , 8/10 « ئاب » / 1930 ، وەکیلی مەندووبی سامی ی و وەکیلی سەرەك وەزیرانی عیراق ، بەکەرکووك و هەولێرو سلێمانییدا گەڕان . لە 8/10 دا – پێش لابردنی موتەصەڕڕیف بە «12» ڕۆژ.– کە گەیشتنە سلێمانیی ، خۆنیشاندانێکی سەربەست و ئاسوودەو ئاشتی خوازانەی جەماوەری گەورەی سلێمانی ی کە دژی ئینگلیزو سیاسەتە گلاوەکەی بوو پێشوازی ی کردن . جەماوەر ، نوێنەرانیان ڕاسپارد – بەئاشکرا – داوای مافی خۆیان بکەن . (بنووارە : ژیان – ژ 257 پینجشەمە 14 ئاغستوس « ئاب » 1930 کە بەدرێژیی هەموو شتێك باس دەکات ) سەرئەنجام نوێنەرانی جەماوەرو بەرامبەرەکانیان ، تەواو لەیەکتر دوورو بڕوا جیاواز بوون ، بەڵکو هەڕەشەیان لەیەکتر دەکرد ، کەدیارە ، بارەکە ترسناکە .

دوور ناڕوێین و – لێرەدا – ئەم پرسیارە تەماشا دەکەین : 4 مانگە ، لە (10) ی مایسەوە ، بە (16) ی تەمووزدا ، هەتا (10) ی ئاب ، توفیق وەهبی (دنیادیدەو ئەفسەرێکی ناسراو ) موتەصەڕریفی سلێمانییە و ئەم ڕووداوانەش زیاد دەبێت ، ئا ئەم باسە چەندی بەچەند ؟

یان ئەوەتا بێ دەسەلاتەو فەرمانی میری ی بێ ڕایی ناکرێت کە ئەم لافە بە توانای ئەو ناوێرێت ، یان ئەوەتا خۆی ئاگری بن کایە ، هەر هیچ نەبێت پێی خۆشەو ڕێگای خۆش دەکات کە ئەمەش – بە خەیاڵی ئەوان – نابێت ڕووبدات ، بەتایبەتی کە پرۆژەیێکی گەورەیان بەڕێگاوەیە . کەوابوو دەبێت ئەو موتەصەڕریفە – کورترین تەمەنی موتەصەڕریفی‌یەتی ی بەشی بێت ، بەڵکو لەوەزیاتر کار کەناربکرێت ، بەڵکو هەر نابێت لەوولاتدا بمێنێتەوە کە هەر وایش ڕووی داو توفیق وەهبی ، لە بەیروتدا نیشتەجێ بوو کە لە 1932 شدا ، لەوێوە ، بەیان نامەی دەرکردو لەوەش دەچێت هەتا 1935 لە گێژاوی ناهەق و نارەوادا ژیابێت ، وەك لەو ساڵەدا پیرە مێردی شاعیرو ڕۆژنامەنووس – لەلاوە – هەواڵێکی ئەوی بڵاو کردووەتەوەو دەڵێت : (توفیق وەهبی بەگی موتەصەڕریفی پێشووی خۆمان ، بیستمان بۆ خدمەتێکی باش نێرراوە . مەملەکەتەکەمان سەراپا پێی خۆشەو سپاسی دیوانی و ڕەهبەری ی ئەو کەسە دەکا کە بە حیسسێکی ویجدانی ی و ئینسانی ی ئەم کوڕە قیمەتدارەی وولاتەکەمانی لە : گێژوای ناهەق و نارەوا دەرهانی . / ژیان : س 10 . ژ 447 شەمو 7 ی تەمووز 1935 ) .

* * *

## پەراوێز . سەرچاوە

(1) — شێخ حەسەن کوڕی شێخ مەعرووفی نودێ . زانلو کەش شوناسی کورد . ناسراوە بە شێخ حەسەنی گلەزەردە ، بەناوی (ڕۆژ ژمێرە زانستی‌یێکەی ) کە عەبدولڕەقیب یووسف خەریکی بووژاندنەوەیەتی . شێخ حەسەن لە دەوروبەری 1088 هـ = 1677/ 1678 ز – هاتووەتە دنیاوە . (لە 1175 هـ = 1762 لەسلێمانییدا کۆچی کردوو – تاریخ السلیمانیة وانحاءها : (امین زکی . 1951)

(2) — مەشرووتی‌یەت = ژیان لەسیبەری دەستووردا . لەتورکیای عوسمانییدا ، لەسەرەتادا لە فەرمانڕەوایی سەرەك وەزیران – مەدحەت پاشا : 1822 — 1884 دا – دەستوور : 1876 ، دانرا . بەهاتنی سوڵتان عەبدولحەمید هەڵوەشایەوە . لە 1908 دا سەرلەنوێ ژیانی دەستووری دامەزرایەوە .

(3) — گوتاری « نەتەوەو زبانی کورد » ڕۆژنامەی : ژیان . س – 7 . ژ – 326 . پینچشەمە 16 حزیران 1932 . سلێمانی .

(4) — ئە : – ڕوژکرُد = ڕۆژی‌کورد : بڵاوکردنەوە (ی نوێی) و پێشەکی و لەسەر نووسینی : جەماڵ خەزنەدار – 1981

بێ : ـ س ـ 1 ژ ـ 3 . ل 24 . ڕەمەضان 1331 هـ = 1913 ز .

(5) — ڕۆژی کورد . هەمان ژمارە . ل 32

(6) — بۆ زانین ، بڕووانە : 1 — کردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى . د . کمال مظهر احمد . بغداد ـ 1977 . 2 — الجيش الروسي في حرب العراق 1914 — 1917 . شکری محمود نديم . بغداد ـ 1974 .

(7) — پیشکوتن ـ سلیمانی . س ـ 1 . ژ ـ 1 . 29 نیسان 1920

(8) — هەروەها پەخشانی هونەرانەی وەك ، بۆچڕووك ـ زەکی صائب ـ پێشکەوتن : س ـ 1 . ژ ـ 30 . 18 نۆڤمبر ، ت 2 ، 1920 ، . زەکی صائب = مستەفا صائب = کوردی : لە 25 ی ئابی 1904 لەکفرییدا دنیای دیوە . ئەندازیار ، نووسەر ، پێشڕەوێکی هوشیارو دەست ڕەنگین و بووژێنەوەی چەندین یادگاری ئەدەبی ی شاعیرانی کورد ـ بەزنجیرە ـ لە سالانی (1930) ەوە بە ناو ی (کوردی = خۆی + مەریوانی = تاهیر بەهجەت مەریوانی) یەوە بلاوکرانەوە . [ سەرچاوە ، بە دەستکاریییەوە لەخەوما ـ جەمیل صائب . بلاوکردنەوەی : جمال بابان . بەغدا 1975 ] زەکی صائب لە 1980 ؟ دا کۆچی کردووە .

(9) — چیرۆکی : وەك ـ نات پێنکرتۆن . هەروەها : لە مالی کۆیخا ئەرتیفای ئەلیکساندر دۆملس . پیشکەوتن ـ ی 1920 .

(10) — بەسەرهاتی مێژوویی وەك : 1 — نسب طەوائیفی کوردان و ڕەووشتیان . پیشکەوتن : 17 ، ت 2 ، 1920 (زنجیرەییکەو هەلەی مێژوویی تێدایە ، لە سەرەتادا ، کە کورتیی : شەرەفنامەیە ) 2 ـ صەد سال لەمەوپێش . پێشکەوتن : 1920 (وەرگێڕانی گەشتەکەی مستر ریچ ـ 1820 ەبە زنجیرە ) .

(11) — شیعری شاعیرانی وەك : م . نوری ( = شێخ نووری شێخ صالح : شاعیرو ڕۆژنامە نووس و سیاسیی : 1897 ز ـ 1958 ز / سلێمانی ) و عەلی کەمال ( = عەلی کەمال باپیر ئاغا : 1887 ز ـ 1974 ز / سلێمانی ) و بێخود ( = مەحموودی حاجی مەلا ئەمینی موفتی ی کەورە ، چاومارَ : 1897 ز ـ 1955 / سلێمانی ) .

(12) — پێشکەوتن : س ـ 1 . ژ ـ 44 فبروری ، شوبات ، 1921 (وەك ئیملاکەی ئەمان نووسیوەتەوە ) .

(13) — نموونەکانی (دیاریی کوردستان ؛ ئە : ـ س 1 . ژ 5 . سێ شەمو 12 مایس 1925 ، ژ ـ 6 . جومعە 29 مایس 1925 / کوردیەکەمان بەچۆن حەرفێك و چۆن بنووسین ـ توفیق وەهبی . بێ : ـ س 1 . ژ 5 ، لەچووارەوە) ، ژ ـ 6 ، ژ 8 شەمو 4 تەموز 1925 / نوسینی کوردی چۆن بێ ، ئیملای کوردی حروفاتی عێرەبی ـ حقی شاوەیس . ) .

(14) — دیاریی کوردستان . ژ ـ 11 , 12 شەمو 5 ك 1 . 1925 / کوردی بە چ حەرفێ بنوسرێ ـ پیرۆت ؟ (دیاریی کوردستان ـ بەغدا) .

(15) — حقی شاوەیس = ئیسماعیل حەققی شاوەیس . نووسەرو کەلە پوور دۆست . سیاسیی . خاوەنی ، پرو پووچی پیشینان ـ چاپخانەی نەجاح بەغدا 1938 . هەروەها : قسەی پێشنیان ـ چاپخانەی ئەیتام . بەغدا 1933 ، لە 1896 دا لە مووسڵ دنیای دیوە ، لە 12 ئاپاری 1976 دا لەسلێمانییدا کۆچی کردووە .

(16) — پیرەمێرد ، لە مایسی (1935) ەوە بە تەواوەتی ی کەوتە بلاوکردنەوەی نووسینی لاتینی ی کە ڕۆژنامەی ، ژیان ، بەلگەیەو بۆ وێنە بنووارە شیعری : فریشتەی خۆی . ژیان : ـ 447 تەموز 1935 . ( پیرەمێرد = توفیقی مەحموو ئاغای هەمزاغای مەسرەف : 1867 ز ـ 19 حوزەیران 1950 سلیمانی ) .

(17) — مەعروف جیاوك ـ ی کوڕی عەلی ئەصغەر ئەفەندی ی ناوداری بنەمالەی جیاووك . پارێزەر . سیاسیی و نووسەر . لە 1885 دا لەبەغداددا هاتووەتە دنیاوە . خوێندنی ـ ماف ـ ی لە ئەستەموولدا تەواو کردووە . لەجەنگی یەکەمدا بەشدار بووە . لە 1923 دا لە بەغدادا پارێزەر بووە . لە 1928 دا نوێنەری هەولێر بووە ، لەبزووتنەوەی سیاسیی کوردا ، پێش 1930 دەوری بە نرخی گێڕاوە . دامەزرێنەری یانەی سەرکەوتن ـ 1930 ی بەغدایە . لە 1944 دا موتەصەڕیفی سلیمانی ی بووە . چەند دانراوێکی هەیە ، وەك : بەرگی ئیملای کوردی ـ چاپخانەی نەجاح . بەغدا . 1930 . هەروەها بەعەرەبییش ، القضية الكردية ، ؟

(18) — بنووارە : پێشکەوتن ؛ س ـ 2 . ژ ـ 91 . 19 جنوری ،ك 2 ، 1922 . گوتاری : زبان ـ م . نوری .

(19) — بنووارە سەرچاوی پێشوو .

(20) — بنووارە : پێشکەوتن ؛ س ـ 2 . ژ ـ 87 . 22 دیسمبر ، ك 1 ، 1922 گوتاری (زمانی خۆمان لە بیر نەچێ ـ موصل : کویسنجق . ڕەسووڵ ناجی) هەروەها ، پێشکەوتن : ژ ـ 89 ژ ـ 91 ـ ژ ـ 92 ی 1922 .

(21) — ئەنجوومەنی مەعاریفی سلێمانی : لە 1925 دا دامەزراوە . یەکەم کۆبوونەوەی = پینجشەمە 12/ 11 ، ت 2 ، / 1925 بە سەرۆکایەتی ی موتەصەڕیف ئەحمەد بەگ توفیق بەگ بووە . (سەرچاوە : ژیانەوە : س ـ 2 . ژ ـ 50 . 26 / ت 2 / 1925 ) .

(22) — کۆمەلی زانستی ی بە فەرمانی ژمارە 2571 ی 2/ 2/ 1926 ی وەزارەتی ناوخۆ دامەزرا . ئەحمەد بەگ توفیق بەگی موتەصەڕیف دامەزرێنەری بوو . لە 3 — 2 نیسان / 1926 ئاهەنگی دامەزراندنی کرا . (بنووارە : ژیان ـ س 1 . ژ 11 پینجشەمە 1 نیسان 1926) .

(23) — کۆمەلی بژاری کوردی ی ـ لەووشەی بێگانە ـ لەسەر پێشنیاری ئەحمەد بەگی موتەصەڕیف بوو ، پاش دامەزراندنی کۆمەلی زانستی ی . لە 1 ی کانوونی یەکەمی 1926 دا کۆمەلەکە ئاهەنگی بۆ گێڕا (بنووارە : ژیان ـ س 1 . ژ 45 . پێنجشنبە 9 / کانوون اول / 1926 .

(ئەحمەد بەگ توفیق بەگ = لەبنە مالەیێکی ناودارە ، باوکی لەجەنگی یەکەمی جیهاندا شەهید بووە . خوێندنی بالابووە . لە 1924 ـ 1927 دا یەکەم موتەصەڕیفی سلێمانی بووە . جاری دووەم لە 28 / 4 / 930 هەتا

24 / 4 / 1935 (سەرچاوە : دۆسێ لەپارێزگای سلێمانییدا ) . ئەمجا بووە بە موتەصەڕیفی هەولێر . دامەزرێنەری ئاوەدانی‌ی سلێمانی‌یە لە دووای دامەزراندنی حکوومەتی عێراقەوە . لە1925 دا بۆ بەربەرەکانی داوای تورکە کەمالی‌یێکان کە ویلایەتی مووسڵ بگێڕنەوە ، ئەحمەد بەگ لە سلێمانیدا کۆمەڵەیێکی بەسەرۆکایەتی‌ی خۆی دروست کرد ، ناوی نا « جەمعی‌یەتی مودافەعەی وەطەن » و رۆژی 14 ی شوباتی 1925 کۆمەڵەکەی بەئاشکرا خستەکار . (بنووارە : ژیان ـ ژ . 16 . 19 شوبات 1925 ) . لە 10 ی کانوونی دووەمی 1963 لە بەغدادا کۆچی کردووەو نێژراوە .

(24) — توفیق وەهبی : لەگوتاری (ئەسڵ پیتە قالبی‌ی ـ ئە ـ ی شێوەی سلێمانی . ل 22 ) دا دەڵێت : مامۆستا سەعید صدقی‌ی ، نووسەری « مختصر صرفو نحوی کوردی » 1928 مەلایێکی پیرەمێرد بوو کە دەشێ لە بەرەو دووایی 70 کانی سەدەی نۆزدەمدا چوو بێتە بەر خوێندن لەمزگەوتەکانی سلێمانیدا .

(25) — چاپخانەی : نەجاح . 1928 بەغدا .

( ئەنجوومەنی مەعاریفی سلیمانی‌ی لە چووارەم کۆبوونەوەیدا . لە 1928/2/16 دا بڕیاری چاپدانو بڵاوکردنەوەی بەقوتابخانەکاندا دا ... بنووارە : ژیان ـ س 1 . ژ 5 . 18 شوبات 1928 ) .

(26) — چاپخانەی : دار الطباعة الحديثة . بەغدا . 1929 .

(27) **(مەبەستی کتێبکەی مەلا سەعید صدقي کابانە.. ئەو باسانەیش لە: حول مقال مسؤولية الأديب الكردي. ل 10 بڵاوکراوەتەوە).**

(28) — ژیان : س ـ 5 . ژ ـ 240 .

(29) — ژیان : س ـ 5 . ژ ـ 241 (وەك 3 هەم کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی مەعاریف لە 2/11 / 1926 دا نیشانی دەدا

**(بنووارە: ژیان: س — 1 — ز — 5 — 18/ شباط /1926)**

أ: ئەحمەد حەمدی ئەفەندی کاتبی

تەحریراتو زیوەر ئەفەندی موعەللیمی مەکتەبی دووەم ، 2 ئەلفبای کوردی‌ی تەئلیفو بۆ تەدقیق طەبعو قبوڵ کردنی ئەو ئەثەرانە لە مەکاتبی کوردیدا ، تەودیعی ئەنجوومەنی مەعاریفیان کردووە . / دیارە قیرائەی ئەلفباکە زووتر داینائو پاشان کە بڕیاری لەسەر ئەدراوە ، پەیڕەوی‌ی دەستووری توفیق وەهبی کردووە . نازانین ئەوی زیوەر ئەفەندی‌ی کامەیە ! ) .

ئەحمەدی عەیزاغا = ئەحمد (حەمدی نازناوە) عەزیز ئاغایە . مامۆستاو نووسەر لە 1894 — 11/4 / 1969 دا لە سلێمانییدا کۆچی کردووە .

(30) — لە ، پێشکەوت = پێشەکی‌ی دەستوورەکەدا .

(31) — حول مقال مسؤولية الاديب الكردي ـ توفيق وهبي . مستل من جريدة التآخي : 1973 . بغداد . ص 11 ، نشر ، محمد الملا عبدالكريم . مطبعة التآخي .

(32) — سەرچاوەی پێشوو : ص12

(33) — خوێندەواری‌ی باو ـ توفیق وەهبی . بەغدا ـ دار الطباعة الحديثة 1933

(34) — گەلاوێژ : س ـ 4 . ژ ـ 1 . ك 2 . 1943

(35) — حول مقال .. ص 13

(36) — ئە : ـ ئیبراهیم ئەمین باڵدار لە لاپەڕە : 84 , 86 , 91 ی « زمنگی کاروانی ڕێنووسی کوردی ـ خۆی ـ چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق . 1982 » دا دەڵێت : کەڵکم وەرگرت لە بیرو باوەڕە نایابەکانی مامۆستای بەنرخ توفیق وەهبی بەگ لەدەستووری زمانەکەیدا : هەروەها لە ئاموژگارییە بەنرخەکانی . (زیاتر کە باسی چاپخانە وڕێنووس دەکات ، دەڵێت ) : کە خاوەنی ـ چاپخانەی نەجاح گوتی کە وەختی خۆی مامۆستای بەنرخ توفیق وەهبی بەگ پێی ووتووم کە هەندێك لەو جۆرە پیتە کوردییە نوێیانە بهێنم .

بێ : ـ ئیبراهیم ئەمین باڵدار (1923 لەسلێمانییدا چاوی کردووەتەوەو مامۆستای خانەنشینە) پسپۆڕێکی پەروەردەیەو لەبەشی زانستی پەروەدە ـ زانکۆی سانفرانسیسکۆ : 1961 ـ خوێندنی باڵای تەواو کردووە . مامۆستا بوو لە زانکۆی سلێمانی‌ی ـ صەلاحەددین‌و دووا کتێبی بەناوی : الاستعداد للقراءة والكتابة ـ 1983 بەغدا ـ یە .

(37) — بەکر دلێر = بەکر عومەر یەحیا . رۆژنامە نوس‌و ئەندازیاری کۆچکردوو . وەك کۆڵیوماتەوە : لەگەلاوێژو دەنگی گێتی‌ی تازەو پەیام ـ دا گوتاری جۆربەجۆری نووسیوە . هەروەها لە پەنجاکاندا لە رادیۆی کوردییدا ، گوتاری هەبووە .

(38) — پەیام = درێژەی بڵاوکراوەی ، ئاگاو رووداوی هەفتەیی ، ی یەو لە (1948) موە دەرچووەو هەتا ژمارە 335 . ب 8 . 27 شوباتی 1956 مان دیوە . گۆڤارەکە لە 1953 دا چەند نیشانەیێکی بۆ پیتە کوردی‌یێکان داناو بەردەوام پەیڕەوی کرد کە بەئامۆژگاری‌ی توفیق وەهبی بووە .

(39) — ئە : ـ زنجیرەکە 5 نامیلکەیە : ئەشکەوتی گوندۆك ـ 1951 . کار کردنی بەکەڵك ـ رفیق چالاك : 1952 . هەرموەزی ـ بەکر دلێر : 1953 . گیروگرفتەکانی کۆمەڵایەتیمان ـ بەکر دلێر : 1954 . دادی کۆمەڵایەتی ـ بەکر دلێر : 1954

بێ : هەرموەزی ، دادی کۆمەڵایەتی ؛ پاشکۆیان کە دەڵێت : « بەبونەی دەست پێ‌کردن بەبەکارهێنانی نیشانە تایبەتی‌یێکانی نووسینی کوردی ، تیپە دەنگی‌یێکان‌و تیپە بزوێنەکانی بەتیپی عەرەبی‌و لاتینی‌ی‌و نموونەیشی نیشان داوە . (جگە لەمە) لە ئەشکەوتەکەی گوندۆکدا ـ وەك پاشکۆ ـ شەجەرەی زمانی کوردیی ، دانراوی توفیق وەهبی بڵاوکراوەتەوە .

(40) — حول مقال مسؤولية الاديب . ص 12 .

(41) — بۆ دەست پێ‌کردنی ، بنووارە : گەلاوێژ : س 3 ژ 9 . 10 ئەیلوول‌و تشرینی یەکەم 1942 . فەرهەنگی گەلاوێژ ـ توفیق وەهبی . هەروەها ژ . 867

تەموزو ئاب 1942 .

(42) — کەلاویژ : س 4 . ژ 1 ك 2 . 1943

(43) — قواعد اللغة الكردية . 1 . 1956 مطبعة البنان ـ بيروت .

(44) — کەلاویژ : س 4 . ژ 3 . مارت 1943

(45) — (تێبینی : توفیق وەهبی ← کەلاویژ : س 1 . ژ 5 . 6 بنج و بناوانی زمانی کوردی ی ـ ووتاری چوارەم ببینە ) .

(46) — کەلاویژ : س 1 . ژ 8 . تەموز 1940

(47) — ئەنثروپۆلوژیا = زانستی مرۆڤ (بایەخدان بە مرۆڤ) سێ جۆرەو لق و پۆپیان لێ دەبێتەوە . جۆری یەکەم : ئەنثروپۆلوژیای سروشتی : کە دوو لقی هەیە : کۆڵینەوە لە ڕەگەزی مرۆڤ . کۆڵینەوە لە لاشەی مرۆڤ .
جۆری دووەم : ئەنثروپۆلوژیای رۆشنبیری ی : کە سێ لقی هەیە : کۆڵینەوە لە پاشماوە ـ کەلاوە کۆنە ـ دێرینەکان . کۆڵینەوە لە تیرەکانی ـ سلالات ـ مرۆڤ . کۆڵینەوە لە زمانە کۆنەکان .
جۆری سێیەم : ئەنثروپۆلوژیای کۆمەلایەتی ی : کۆڵینەوەیە لە پاشماوەکانی خوو و نەریت و ئەتووارو ئەفسانەی کۆن .. هتد .

(48) — بۆ ناسینی وەلامە زانستییەکانی ـ توفیق وەهبی ـ لەڕووی لافەکانی ، مەکەنزی ، بنووارە : مجله المجمع العلمي الكردي . المجلد الثاني . العدد الثاني : اصل الاكراد ولغتهم ـ توفيق وەهبی .

(49) — ROCK — SCULPTURES IN CUNDUK CAVE

With some Anthropological Notes

by

H.E TAUFIQ WAHBY

Reprinted from Sumer vol . IV . No 2 . September 1948

Baghdad — 1raq .

(50) — مجلة سومر ، مديرية الاثار العامة ، الجزء الاول والثاني ـ المجلد السابع عشر 1961 . ص 129

(51) — مجلة المجمع العلمى العراقي ـ الجزء الثاني . المجلد الرابع ـ 1956 (بە نامیلکەش بلاوکراوەتەوە ) .

(52) — مجلة ، الكتاب ، : جمعية التاليف والترجمة والنشر العراقية . العدد الثاني . تموز 1958

(53) — مطبعة المعارف . بغداد . 1965 (طبع في حزيران 1958 نشر في 1965 ) .

(54) — دانانی : (سی . جەی . ئی ، ئەدموندز . ) وەرگێڕانی : توفیق وەهبی . چاپخانەی مەعاریف . بەغدا 1946 .

(55) — مجلة المجمع العلمي العراقي ـ 1950 . ( بە نامیلکەش بلاوکراوەی : مطبعة الرابطة ـ 1950) .

(56) — مطبعة اسعد . بغداد . تموز 1957

(57) — ئەشکەوتی گوندوك (لە پێشەکییە کوردی ییەکەیدا) .

(58) — دەنگی گێتی ی تازە : ژمارە : 1، تشرینی یەکەمی 1943 و بە پێی ڕەزامەندنامەیی وەزارەتی ناوخۆ : ژ 1416 ـ مديرية الدعاية العامة 19/17 / 7 / 1945 بووبە : گووارێکی ، ئەدەبی ، خوێندەواری ، زمانی اجتماعی ، پەیامی . هەفتەی کوردی ی .. (ژ ـ 1 ی دووشەممەی 12 ی ت 2 1945 ، دەرچوو) . خاوەندی ئیمیتازی : محامی فایق توفیق . مودیری مەسئوول : محمد بابان و رەئیسی تەحریری : حوزنی ی موکریانی .

(59) — حول مقال .. ص 13

(60) — حەسەن شێخ حەمە مارف (لەباوکەوە دەچێتەوە سەر شێخ مستەفای ناسراو بە : خەرقە ڕەش ) لە 1920 ـ سلیمانییدا هاتووەتە دنیاوە . رۆژنامە نووسێکی بە توانا ، وەرگێڕ لە رادیۆی کوردیدا ( = لە 13 ئازار ـ 1943 هەتا : 15 مارت 1955 ) لە مانگی 10 ی 1983 دا باسی زۆری لەمەڕ توفیق وەهبی کێڕایەوە کە 18 ساڵێك کەسێکی نزیکی بووە . ئەوی دەوری نووسین و کوردی ییەکەی ـ حەسەن ـ بکاتەوە هەست دەکات پتەوی ییەکەی بۆ ئامۆژگاری ی توفیق وەهبی دەگەڕێتەوە .

(61) — کامل کاکە ئەمین : 1912 سلیمانی ـ ئێستا خانە نشینە . یەکەم وێژەوان و کارگێڕی ڕادیۆی کوردیی بەغدا بووە : 19 ت 2 . 1939 .

(62) — لەگفت و گۆیێکی تۆمارکراومان‌دا : ـ 10 / 11 / 1983 سلێمانی .

(63) — عادل جەمال عیرفان : لە 7/ 1915 دا لە سلێمانییدا هاتووەتە دنیاوە . لە 1951 — 1958 موە وەرگێڕو وێژەوان بووە لە ڕادیۆدا . لەو ماوەدایەدا وەرگێڕ بووە لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردیی لە گۆڤاری : پەیام ـ دا تورکی و عەرەبیی ، هەروەها ئینگلیزی ییکی زۆر باشی زانیوە .( نووسینیمان دیوە ، ڕەوان و جووان بووەو مۆری ڕۆژنامەنووسیی پێوە دیارە ) . لە 25 / 9 / 1969 دا لە بەغدایدا کۆچی کردووە .

(64) — ڕەفیق چالاک : 1923 — 1973 سلێمانیی . نووسەرو مومەسیلی بەتووانا . رۆژنامەنووس . ئەویش یەکێك بوو لە ڕۆژنامەنووسێکی گۆڤاری : پەیام . کارگێڕێکی بەتوواناى رادیۆی کوردیش بوو ، کە جگە لە دەنگی ، کوردی ییەکەی ڕەوان بوو .

(65) — قواعد اللغة الكردية ـ توفيق وهبی ج 1 . ب 1 . 1956 . البنان ـ بيروت + الباب الثاني ، 1956 .

(66) — هەمان سەرچاوە . ج 1 . لە (پێشەکییدا) .

(67) — ، فەرهەنگی : کوردیی ـ ئینگلیزی : توفیق وەهبی و سی . جەی . ئەدموندز . ئۆکسفورد ـ یەکەم چاپ 1966

A Kurdish English Dictionary

TAUFIQ WAHBY

and

C.J. EDMONDS.

OXFORD . First published

1966 .

(68) — ئـەدمۆنـدس = سیسیل جـۆن ئەدمـۆندس . لە 1889 دا لەدایـكبووە . لەكـولیجی كامبـردج ـ دا پێگـەییشتـوە . لە 1922 ـ 1925 دا خـەریكی كاروباری سیاسی‌ی بووە لە كوردستانی خووارووودا . لە 1937 دا « وسلم رافدین » ی دراوەتێ . لە 1935 ـ 1945 ەوە ڕاوێژكاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق بووە . لە 1948 دا لەوەزارەتی كاروباری هەندەران ـ ی بەریتانیادا پلەی وەزیری‌ی هەبووە . لە 1950 دا خانەنشین كراوە . گەلێك بابەت‌و لێكـۆلینەوەیی عـەرەبی‌و فارسی‌و كـوردیی نـووسیـوە . كـوردیی‌زان‌و شـارەزای بـووە . لە 1951 ـ 1967 دا لە « مـەعـهـەدی دیـراسـاتی رۆژهەلاتیی‌و ئافریقییدا » لە زانكـۆی « لەندەن » دا مـوحازیـر بووە . كتێبی « كـوردو تورك‌و عـارەب ـ 1957 » ی ئـەو نـاوداره . هـەروەهـا «فەرهەنگی كوردیی ـئینگلیزی‌ی » لەگـەڵ توفیق وەهبی . لە 26 . ت 1 1970 دا مردووە . (سەرچاوە : كردو ترك‌و عارەب ـ وەرگێرانی : جرجیس فتح الله . 1970 + العراق في الوثائق البريطانية سنـة 1936 . نجدة فتحی صفوت . بصرة 1983 ) .

(69) — لەو كارە گرنگانەی كە ـ نەریمان ـ باسی دەكات‌و دەڵێت : « مامۆستا توفیق وەهبی توانیوییەتی لەم بیست ساڵەی دووایی‌یەدا ئەم بـەرهـەمـانەی خوارەوە ئامادە بكات :

1 — قامووسی كوردی ـ ئاوێستایی ـ سانسكریتی ـ فارسی .

2 — قامووسی پەرتی ـ كوردی .

3 — قامووسێك بۆ چاوگە (مصدر) لە ئاویستایی‌و كوردییدا .

4 — قامووسێك بۆ تەصریفی ئەفعالی مورەكەبە لە كوردی كە بە (كردن)و (بردن) كۆتایی‌یان دێت .

5 — تەئریخی شارەزوور لە دەوری بەردەوە تا ئەمرۆ لەگەڵ پێناسینی ئەو 150 قسن . گۆر) ەی كەتێیدایە .

6 — تەئریخی خەسرەو پاشا

7 — بۆ دەربڕینی پەیوەندی‌و كاركردنی ئاویستایی لەزمانە كانی تردا «؟» (700) ووشەی ئاویستایی لە فەرەنسیدا دۆزیوەتەوە .

8 — نووسین دەربارەی (یەزیدی‌ییەكان) .

9 — نووسین دەربارەی (تەصەووف) .

10 — قامووسی زمانی ئاویستایی .

11 — لە ساڵی (1973)ەوە دەستی داوەتە نووسینەوەی دەستووری زمانی كوردیی بەشێوەییەكی فراوان وەتائێستا (600) لاپەڕەی فولسكابی لێ تەواو كردووەو كەییشتووەتە دووا قۆناغ لەم دەستوورەدا ، بەرەو پێشەوە گـۆڕینێكی خستووەتە بەر ڕێنووسی كوردیی . »

(بڕووانە : آفاق جامعية = ئاسۆی زانكۆیی : العدد 12 . السنة الثانية . ت 2 1978 : فـریای ئـەم گەنجینـەیە بكـەون ـ نەریمـان : ل 79 . هەروەهـا ڕۆژنامەی ـ العراق : 10 / 7 / 1978 نەریمان ) ـ كە لەو ساڵەدا لە لەندەن ـ دا دیدەنی‌ی كردووە .

(70) — توفیق وەهبی = كوڕی مەعرووف كوڕی محەمەدە (دایكیشی : عاصمەی كچی ڕەسوول مەستی‌ی ئەفەندی ـ یە كـە زاناو نـاودار بووە ـ ئـەمین زەكی : لە تـاریـخ السليمـانيـة . ص 250 نـاوی بـردووە) . لە 1892 دا لەسلێمـانییدا هـاتووەتـە دنیاوە (خـۆی لە : گۆڤـاری كۆڕی زانیـاری كورد ـ دا . ب 1 . ب 1 . 1973 دەڵێت كە ) ـ بە منالی‌ی لای مەلا دەستی بەخوێند كردووە لەحوجرەدا . دووای خوێندنی ڕوشدی‌ییەو ئەعدادی عـەسكـەریی ، لە 1908 دا بـەیـەكـەمینی پـۆل ، بـە مـولازیمی دووەم لەمـەكتەبی حـەربی‌ییەی بـەغدا دەچـووە . لەهـەمـان سـاڵدا جـۆی كـراوەتەوە بـۆ مەكتـەبی ئەركـانی حەرب‌و چـووە بۆ ئـەستەمـووڵ‌و لەمەكتەبی ئەركاندا وەرگیراوە . بەڵام لەو كاتەدا بەپێی تەرتیباتی تازەی توركەكان پۆلی یەكەمی ئەو مەكتەبە هـەڵوەشاوەتـەوەو ئەفسـەرەكان نێرراوون بۆ ناو ـ ئۆردوو ـ كە دوو ساڵ مەشقی تێدا بكەن . بەو جۆرە هـەتا 1911 لەمـەشقدا بـووە . ئەو كـاتە بـزووتنی ئەرنـائوود دەستی پێكردووە . ئەویش بە ئارەزووی خـۆی هاوبـەشی‌ی لەشكری تـوركی كردووە . دووایی خەڵات كراوە ، ئەمجا چووەتە مەكتەبی ئەركان بەڵام لەم سـاڵەشدا شـەڕی باڵقـان دەستی پێكردووە . مـەكتەب داخـراوەو ئەویش لەگەڵ ـ شەرق ئۆردوسی ـ هاوبەشی‌ی جەنگی باڵقانی كردووە لە 1918 دا دەورەی ئەركانی حەربی لە ئەستـەموولدا تـەواو كردووە . لە 1919 دا هاتووەتەوە سلێمانی‌و یاوەری شێخ مەحموود بووەو بیگباشی بووە . لە 1921 دا لەگەڵ درووست بوونی لەشكری عێـراق ، چووەتـە ڕیزییەوە . لە 1923 دا ئامیری مەدرەسەی عەسكەری‌ییەی عێراق بووەو هەتا 1929 پلەی گەییشتووەتە : عەقیدی‌ی‌و لەو ساڵەدا بۆ 4 مانگ ، پێش چاپ‌دانی : دەستووری زمان / ك . ر . م ، چووە بۆ لەندەن‌و لەدەورەی مەكتەبی ئومەرای لەشكری ئینگلیزدا مەشقی كردووە . شەهادەتنامەی چالاكیی وەرگرتووە . سێیەم موتەصەرریفی ـ تەمەن كورت ـ سلێمـانی بووە لە 10 مایس ـ 22 ئاب 1930 و پاشان دوور خراوەتەوە بۆ لوبنان‌و چەند ساڵێك كار كەنار بووە . لە (1935) ەوە هاتووەتەو سەر كـاروبار . بەڕێوەبەری گشتی‌ی ئەشغال . مەسلحەبووە . وەزیری‌ی كردووە كە لە 1950 دا وەزیری كاروباری كۆمـەڵایەتی‌ی بـووە . پێش 1958 « عەین » بووە . لە 11/ 7 / 1958 ەوە هەتا مردنی لە لەندەندا ژیاوە . ئاسیا ڕیزەلی‌ی كـەیبـانـوی ، لە 1930 دا لەگـەڵ كـۆمـەڵی زانستی ژنـانی سلێمـانی‌ی كەحەپسـەخانی نـەقیب سەرۆكی بـوو ، هاریكـاری‌ی كرد ، هـەروەها لەپەنجاكاندا سەرۆكی ژنان بووە لەبەغدا ـ كە لە 1980 دا لە لەنـدەندا كوچی كردو لە بەغدادا نێژراوە . توفیق وەهبی وەجاخی ڕوونە ، دوو كوڕی هەیە : دوكتور سزا ، موسیقازان : سروش . لە لەندەندا دەژین . (سەرچاوە) « بەدەستكارییەوە » : ڕۆژنامەی : ژیان . ژ ـ 240 . 22 مایس 1930 . هەروەها زانینی تایبەتی‌و پرس لەبنەماڵەی مەستی ئەفەندی‌كە لە سلێمانیدا ) .

(71) — نووسینی : ئەحمد خواجە . چاپخانەی ڕاپەڕین 1971 سلێمانی .

● تێبینی :

1 — وێنەكانی ناشتنی بەكامیرای دۆستم كاك عبدالرقیب یووسف گیراوە .

2 — نووسینە وەرگیراوەكان ، ڕێنووسیان كەمێك دەستكاری كرا .







کورتە چیروکێ مەیدانەکا بەرفرەهـ یا وەرگرتی ل قادا ئەدەبیدا و لنك خویندەواراو کورتە چیروك نەك ل پێش چاڤێ خویندەوارێ کورد هونەرەکێ نویە بەڵکو ژ راستا هـونەرەکێ نویە ل جیهانێ ژی چنکو ل دویماهیا سەدێ نوزدێ یا هاتیـە بـەلاڤـەبـون و پێشکـەڤتن ل سـەر دەستێ [مـوپـاسـان و چیخوف]ی .

بێ گومان پشتی گـوهڕین کەڤتیـە بارێ کـومەلایـەتی و رامیاری یێ میللەتا گـوهڕین و پێشکەڤتن و دەستکـاری کەڤتـە هونەرێ چیروکا کورت ژی ژ لایێ ناڤەروك و روخسار و بیـرو هزراڤە .

کـورتە چیـروك کارەکێ هـونەری یێ نـاسك و ووردە و شارەزایەکا هونـەرمەنـدانە و ئـاوازەکێ شاعیـرانە پێ دڤێت چونکی دکەتە بەحسێ [کەرتەکا کێم یا ژیـانێ یانـژی بەحسێ دەلیڤەکا کێم یان حالەتەکێ دەروونی و ... هتد] ب شێوازەکێ پڕ ماناو مەبەست و تژی بیرو سوز و هەلوێست .

کورتە چیروکا کوردی پێنگاڤەکا باش یا هاڤێتی و جهێ خو یێ کری د ناڤ ئەدەبێ کوردیدا و هەر وەسا لنك خویندەواراو ئێکەمین چیروکا کوردی یا هاتیە نڤیسـین و بەلاڤکـرن ژ لایێ (فوئادێ تەموی) ڤە سالا 1913ز پشتی هنگی چیروکا (لە خەوما) هاتە بەلاڤکرن ژ لایێ (جمیل صائب) ڤە ل سالا 1925و پشتی هنگی بزاڤا چیروك نڤیسینێ زیدەتر لێ هات و پێشکەڤت ژ لایێ ئەدەبی و هونەری ڤە هەتا ئەڤرو ، ڤێ کاڤێ ژی قادا چیروك نڤسینێ بەرفرەهتر لێ هات و چیروك گەشتـر لێ هات ل سـەر دەستێ هندەك چیروك نڤیسێت هەڤچەرخ و گەلەك کومـەلیت چیروکا هاتنە بازاڕی .

ژ وان کومەلێت چیروکا یێت هاتینە بازاری ل سالا (1980ز) کومەلە چیروکێت [چەند یادداشتێن پزیشکەکی] ئەوێت تورەڤانێ هێژا دکتور نافع ئاکرەیی نفیسی .
ئەڤ کومەلە پێك هاتیە ژ حەفت چیروکێت کورت و نەگوتیە ل کیژ سالێ هاتیە نفیسین .

وەك سەحکرنەکێ بو [چەند یادداشتێن پزیشکەکی] دێ بینین دکتور نافع گەلەك بایەخی د دەتە بابەتێت خومالی و مروڤایەتیێ و چیروکێت خو ب ئاوەازەکی شاعیرانە دنفیسیت چنکو چیروکێت وی پڕی نیگارو سوزو دلوڤانیە و هەر وەسا شیوازێ (اسلوب)ێ نفیسینا چیروکێت وی شیوازەکی روون و ئاسانە و هەمی خویندەوار تێ دگەهن بێ ماندیبون .

پشتی مە پێداچونەك کری دناڤ بەر پەرێت ڤێ کومەلا چیروکادا ئەم ڤان چیروکا دادنین ژ چیروکێت ریالیزمی و ریالیزما کومەلایەتی ، چنکو دکتور نافع هەستەکا کومەلاتیا واقعی یا هەی و گەلەك بایەخی د دەتە کومەلێ کوردی و مروڤێ کوردو چیروکێت وی دکەنە بەحسێ چەند ئێشێت پاشکەفتی د چڤاکێ کوردیدا و کا چەند مروڤێت بێ گونەهـ ژ ئەگەرا ڤان ئێشا ل بەر پیا چوینە و هەر وەسا دکەتە بەحسێ تێکەهشتنا بەروڤاژی بو مەسەلێت زانیاری و راستیێ د ناڤ کومەلێ کوردیدا .

چیروکا ئێکێ ژڤێ کومەلا چیروکا یاکو ناڤێ وێ (گوننەها کێیە) بەحسێ دوو دیاردێت (ظاهرە) خەلەت دکەت دناڤ کومەلێ کوردی ، ئێك ژ وان وەسایا رەوایە کو دوتمام بو پسمامییە و هنگی دوتمام ل وێرێ بیت نابیت پسمام چ ژنکێت دی بخو بینیت و یا دووی ئەوە ئەو ژن و میرا یێت زاروك نەبن کومەل گەلەك شەرێ وان دکەت و دادنن کو عەیال نەبون ئێکە ژ گوننەهێت مەزن ئەڤجا دێ د بەر مێرکیرا بێژن داکو بو خو ژنەکا دی بینیت یا ژنا خو بەردەت و چ حیسابا بو ئەڤین و وەفادار یا دناڤ بەرا هە ردووکا ناکەین و ئەم دبینین چاوا بابێ شڤانی و دایکا وی و چوار خویشك و کەسوکارێت وی هەمی شەرێ وی دکەن و قەسا دبێژنێ ، دا بو خو ژنەکا دی بینیت چنکو ژنا وی (شیرینێ) زاروك نابن و هەرو هەمی گاڤا شەرێ وی دکر ل سەر ڤێ چەندێ هەتا جارەکێ شیرینێ ژی پیچەك ژ گەنگەشەکا وان گولێ بوی و عەبایێ خو هەلگرت قەستا شەقامی کر ... شڤان ژی دوویڤرا چو دا نەچیت ... ئوتومبیلەکێ ل هەر دووا دا ... شیرین کوشت و شڤان ژی بریندار دبیت ، شڤانی دبەنە دختوری و لێ بێهنەك بێ نەچو ئەو ژی دمریت و تەمام دبیت ، بەلێ پشتی گفت و گویا دختوری و بابێ شڤانێ دەرکەفت ئەگەرا نەبونا عەیالی ژ هندێیە کو (خوینا) شیرینێ و شڤانی وەك ئێك نەبو [ئێك ژوان ئو نێگیتیف بو یا دیژی ئو پوزێتیف بو] .

ئەڤجا ژنوکا بابێ شڤانی دەستێت خو ل سەرو میشکێت خو دان و کرە هەوارو گازی و قیژی بەلێ پشتی کەنگی ؟ .

هەر وەسا دڤێ چیروکێدا بومە دیار دبیت کو ئەگەرا نەبونا عەیالی چیە ژ لایێ زانیاری ڤە و کا چاوا کومەل مەسەلێت زانیاری بەروڤاژی تێدگەهیت ، ب راستی مانشێتا ڤێ چیروکێ گەلەکا دجهێ خودا بوو گەلەك دگەل ناڤەروکا چیروکێ دگونجی .

چیروکا دووێ چیروکا نێرگزا بریندار ل زمانێ گیاندارا دهێتە ئاخفتن یا جوانتر ئەو بو ب هزرا من ل سەر نفیسیبا بو زاروکایە چنکو ب شێوەکێ گشتی ئەڤ توخمە چیروکێت هوسا بو زاروکانە . چیروکا سێ چیروکا (ناڤێ من کی دێ هەلگریت) بەحسێ دیاردەکا دی دناڤ کومەلێ مەدا دکەت ئەو ژی مەسەلا ناڤ هەلگرتنێ و شوینەواریێ ... ئەڤێ مەسەلێ جهێ خو دناڤ کومەلێ مەدا یاگرتی و کور شوینا بابێیە و کەس ناڤێ بابێ نا هەلگریت ئێلا کورو پاشی بەحسێ مروڤەکی دکەت یێ چوبە باژێری و یێ شەپرزەیە ژبەر بوشاتی و قەلەبالغا باژێری و سەر تەختێ چایخانێ یێ روینشتی بو (تەماشەی سەروبەرێ ژیانا باژێری دکر) دەمێ شوشەکێ پیپسیێ ب گوزەکا وی کەفتی و بریندار کری .. هندەکا پیچەك بو دەرمانکرو کرە دناڤ ئوتومبیلەکێ بو خەستێ ... پاشی ئوتومبیلەکا دی ب رێکێ ڤە ل ئوتومبیلا وان دا و جارەکا دی بریندار کرە ڤە و ئەو مروڤ خرابتر لێ هات و هند خو دیت مروڤێت وی یێت لێ کوم بوین و یێ وی یێ (گێج) کری .. ئەڤجا دووی دەراڤی تەندروستی یێ تەنگاڤ و نەخوشی ئەو پرسیارا ژنکا خو دکر کا زاروك بو یان نە ؟ پشتی

حازرا گوتی ژنکا ته یا باشه‌و کوڕه‌کێ بوی .. گه‌له‌ك که‌یفا وی هات‌و هه‌ر پرسیارا کوڕی خو دکر ، هنگی هه‌میا دگوتێ تو یێ نه‌ساخی‌و پسیارا خو بکه تو فه‌رتری .. ئه‌وی هه‌ر پرسیارا کوڕی خو دکرو دگوته مروڤێت خو هوین ناڤێ من ناهه‌لگرن ... کوڕی من دێ ناڤێ من هه‌لگریت .. ئه‌ڤجا بڤی ره‌نگی چیروك بو مه دیار دکه‌ت کا هه‌تا کیژ (پلێ) مروڤێ کورد بایه‌خی د ده‌ته شوینه‌واری‌و ناڤ هه‌لگرتنێ‌و کا چه‌ندێ پێ خوش‌و شاد دبیت ده‌مێ کوڕ دبیت .

چیروکا چوارێ ژ ڤێ کومه‌لێ ل ژێر ناڤێ (فاییروما)یه ، نڤیسه‌ڤان ل سه‌ر دوو هزرو دیاردیت دی بیت ره‌وا دناڤ جڤاکێ کوردی‌دا دئاخڤت .. ئێك ژ وان ئاڤزبونا کچکێ (نه‌ژنکێ)و نمونه‌کێ دئینیت دناڤ چیروکێ‌دا کا چاوا کچه‌کێ ب شه‌رم‌و ترسی‌و شه‌مزاریڤه د به‌نه دختوری‌و کچك ڤه دشێریت‌و دبێژیت زکێ من دئێشیت‌و هندی دهێته خو نه‌شێت بێژیت ئه‌زا ئاڤزم‌و چیروك دیار دکه‌ت کا چاوا ده‌مێ مروڤێت وێ زانی یه‌کسه‌ر کوشت‌و نه‌هێلا ... هزرا دووێ دڤێ چیروکێ دا ئه‌وه کو ئێشه‌ك یاهه‌ی ناڤێ وێ (فاییروما)یه یڤێ ئێشێ زکێ کچکێ یان ژنکێ مه‌زن دبیت‌و ره‌نگێ ئاڤزبونی د ده‌ت‌و کومه‌ل وه‌سا تێ دگه‌هیت کو ئه‌و کچك یا ئاڤزه‌و وه‌ختێ کومه‌لی هزرا ئاڤزیێ بو کچه‌کێ دانا ئه‌وێ کچێ چ حال‌و عه‌یش نابیت ژبه‌ر فهێتیاو ترسێ‌و هه‌تا کچکێ دبه‌نه خه‌سته‌خانێ ده‌ر دکه‌ڤیت ئه‌و زك مه‌زنبون (فاییروما)یه نه‌ك ئاڤزیه‌و (پیناسا فاییروما ژ لایێ زانستیڤه یا چیروکێ دا هه‌ی) .

بڤێ شێوه‌ی دکتور نافع ئاکره‌یی بومه خویا دکه‌ت د چیروکێ‌دا کا چاوا گه‌له‌ك جارا کومه‌لێ مه تشتێت زانستی خه‌له‌ت تێ دگه‌هیت‌و ئه‌ڤ چه‌نده ژی دبیته ئه‌گه‌را په‌یدابونا هنده‌ك کوشتن‌و رویدانێت مه‌زن .

«کی یێ شێته» چیروکه‌کا هه‌ژیا ڤێ کومه‌لێ‌یه ، دکه‌ته به‌حسێ کچه‌کا نه رازی بڤی ده‌ست‌و دارێ دوینایێ‌و چونیه‌تیا ژیانێ لڤێ جیهانێ‌و کا چاوا شه‌ڕو کوشتن بیت زور بوین‌و چ بهایێ مروڤایه‌یتێ‌و مروڤانیێ نه‌مایه‌و چ ترازوی نه‌ماینه راستیێ پێ بێته کێشان‌و ئه‌ڤ کچه ژبه‌ر ڤان ئه‌گه‌رێت مه گوتی هه‌ر یا دگه‌ل خو دکه‌ته ڤێڕی‌و هه‌وار .. مروڤێت وی وه‌سا هزر کر کو کچك یا شێت بی‌و دچنه دویڤ دختوری‌را دختور دهێته وێرێ سه‌حدکه‌ته کچکێ گه‌له‌کا خوڕستیی‌یه (طبیعی)و نه‌یا شێته ، به‌لکو گه‌له‌کا دروسته ، چنکو کچك نه‌رازیبونا خو دیار دکه‌ت به‌رامبه‌ر به‌رزه‌بونا. راستیێ‌و خه‌باتێ دکه‌ت دژی دره‌وێ‌و دوو روییاتێ‌و خومه‌زنکرنێ ...

ئاخڤتنێت کچکێ کاره‌کێ مه‌زن ل دختوری دکه‌ن‌و نه‌شیا بنڤیت هه‌تا سپێدێ هه‌ر یێ مژیول بو ب مه‌سه‌لا کچکێ‌ڤه‌و ڤی نمونێ مروڤی دکومه‌لی‌دا .

ب راستی ئه‌ڤ چیروکه گه‌له‌کا ئارمانجبه‌ر بو چنکو ئه‌ڤ نمونه د جڤاکێ مه‌دا د زورن .

چیروکا شه‌شێ ژ چیروکێت (چه‌ند یادداشتێن پزیشکه‌کی) چیروکا «گوله‌کا دی ژی وه‌ریا» ئه‌ڤ چیروکه هێرەشه ل سه‌ر هنده‌ك هزرو ته‌خمینێت که‌ڤن دناڤ جڤاکێ کوردی‌داو دکه‌ته به‌حسێ (هوشیاری) کا چاوا ئه‌وو هه‌ڤالێت خو چونه ده‌رڤه‌ی باژێڕی‌و بوْ خوْ ڤه‌خوارن بر دا پیچه‌ك خو ژ بیر ڤه‌که‌ن‌و سه‌ربه‌ستیا خو وه‌رگرن ... ل ئاقاری ماره‌ك ب هوشیاری ڤه‌دده‌ت ... هه‌ڤالێت وی د هه‌لدگرن‌دا ببه‌نه خه‌سته‌خانێ به‌لێ هوشیاری گوتێ من ببه‌نه مال چنکو بابێ من وه‌ناکه‌ت بچمه خه‌ستێ ، ئه‌ڤجا دبه‌نه مال ... ل مال بابێ وی شه‌ڕی هه‌ڤالێت وی دکه‌ت‌و قه‌بول ناکه‌ت ببه‌نه خه‌ستێ‌و ڤرێدکه‌ته دویڤ مه‌لا عه‌لی‌راو نانێ مالا شێخی‌و حجی سمایل دا پێ وی بمژیت ... پشتی ب هه‌ر حالێ هه‌یی هه‌ڤالێت وی دختوری دئینه مال ، به‌لێ بابێ هوشیاری رازی نابیت هوشیاری ببه‌نه دختوری‌و بکوته‌ك رازیبو کو ل وێرێ چاره‌سه‌ریا وی بکه‌ن ... د ده‌لیڤه‌کی‌را ئوتومبێلا ئیسعاڤێ هات‌و ب له‌زو به‌ز هه‌ڤالێت وی‌و دختوری هوشیار دانا دناڤ ئیسعاڤێ‌دا ، به‌لێ فایده نه‌کرو ته‌مام‌بو !! ...

ڤێ چیروکا به‌رکه‌ڤتی بومه وێنه‌کێ فوتوگرافی یێ دیارده‌کا پاشکه‌ڤتی‌و که‌ڤنه په‌رست گرت‌و دانا پێش چاڤێ مه‌و مه ژی دیت پلا باوه‌ریا بابێ هوشیاری ب ئه‌فسانێت هیچ‌و

پویچ و دویر ژ زانیاریێ و هەر وەسا مە دیت کا چاوا ئەوگەنگەشا بابێ وی کری دگەل دختوری و هەڤالیت وی ل سەر خەستێ و شێخ و مەلاو قەلەبالغا وان گەلەك وەخت بورانـدو ب خەستەخانێ را نەگەهشتن و هوشیار تەمام بو !! ...

(حەقێ فەحسێ) چیروکا دویماهیی‌یە یا ڤێ کومەلێ ... ب راستی ڤێ چیروکێ پیچەك جیاوازیا هەی دگەل بابەتێ چیروکیت دی و ب هزرا من بەحسێ مەسەلەکا هەڤچەرخ و تایبەتی‌یە ... چنکو دکەتە بەحسێ دختورەکی و دختوری هزرێت هەژاریا خودکرن دەمێ قوتابی و نان نەبو بخوت و گەلەك ڕوژی دگرتن چنکو خوارن نەبو بخوت و ڤی دختوری چەند نەخوشیەك دیتبا ئەڤ رویدانە ژ بیرێ نەدچو ... پاشی دکەتە بەحسێ گینگەشا مروڤەکی و دختوری ل سەر حەقێ فەحسێ ... پاشی دهێتە سەر بەحسێ مالا (جەوهەری) کا چاوا جەوهەر ب باب ڤەودوو براڤەو رەزو ملك و مالاتی ڤە نەماو پویچ و پەڕاتە بوو کەس لێ نەما ژبلی برایەکی و پیرە دایەکێ ئەو ژی نهو بێت د خانیێ نوی‌دا نێزیکی باژێری ... ئەم دشێین بێژین چارچوبی ڤێ چیروکێ چارچوپەکێ قەهری و کوڤانیێ‌یە بگرە ژ هەژاریێ هەتا وێرانکرنا مالەکێ و بەر هەر حالێ هەی ئەڤ چیروکە بەحسێ کوڤانەکا هەڤچەرخ .

پشتی مە تشتەك ژ ناڤەروکا هەر حەڤت چیروکا زانی دێ مێینە سەر تایەکێ دی ژ ڤێ پێداچونێ ... لڤێرێ مە دڤێت جهێ داخێ‌یە کو چیروك نڤیسێ مە فولکلور ب کار نەئینایە دناڤ چیروکێت خوداو وا بزانم پێ نەڤێت دووبارەکەین و بێژین کومکرنا فولکلوری و کارئینانا وی ئێکە ژ کارێت هەرە گرنگە ل سەر شانێت روشنبیرێ کوردو دڤێت ئەم ل هەمی بزاڤێت خودا فولکلوری ژ بیر نەکەین و ب کار ببینین چ کومکرن و نڤسین بیت یان ب کار بینین دناڤ شیعرا هەڤچەرخ‌داو چیروکێ‌داو هونەرێ تەشکیلی‌داو شانوییێ‌داو ... هتد .

ئەڤە ژ لایەکی و ژ لایەکێ دی‌ڤە ئەگەر بەرێ خو بدەینە چیروکا (کی یێ شێتە) دێ بینین چارەسەرکرنا نڤیسەڤانی بو حالەتێ کچکێ و بەرسڤێت دختوری دگەل وێ نە چارەسەرکرنەکا زانیاری و راستەقینە بو چنکو پێتڤی بو دختوری هەولێ دابا خەلکێ مالا کچکێ و مروڤێت وێ تێبگەهینیت ب پلا روشنبیریا کچکێ و هەستا وێ و گوتبا وان ئەڤ کچە یا هەقەو نەیا شێتە و هاریکاریا کچکێ کرباو پشتەڤانیا وێ گرتبا ... نەك بێژتێ رێکا راستیێ یا ب زەحمەتەو دێ ماندی بی و وەستی !! بێ گومان ئەڤ وەلامە نەیا زانستی بو ونە وەلاما کچکا خودانا ڤان بیرو هزراو هەستا بو ... تشتەکێ دی سەرنجا من ڕاکێشا دەمێ من پێداچون بڤێ کومەلێ کری ئەو ژی ئەوە ، سێ چیروکێت ڤی کومەلی دەم [الزمن] تێدا نەیا خویا بوو تێدا نەبو چیروکا گوننەها کێ یەو چیروکا فایبروماو چیروکا حەقێ فەحسێ ئەڤ چەندە یانکو نەبونا دەمی دچیروکێ‌دا ژ پلا هونەریا چیروکێ کێم دکەت ...

هەر وەسا کارئینانا چەند (پەیڤێت) کرمانجیا ژێری ژ کاریت قەنج و پڕ سوود بو دکتور نافع پێ رابی و هەولەکا هەژی بو ... ل دویماهیێ مە دڤێت بێژین تورەڤانێ بەرکەڤتی دکتور نافع ئاکرەیی یێ سەرکەڤتی بو دگرتنا چەند وێنەکا ژ جیهانا مە یا پڕ کوڤان و دژایەتی (متناقضـات) و هەول دا بچیتە دناڤ دەروونێ مروڤی و ناڤ ئاخینك و خوزیك و هەستێت وی .

[چەند یادداشتێن پزیشکەکی] پشکداریەکا هەژی بو د قادا چیروکا کوردی‌داو بو مە راستیا ژیانا ناڤخویی و دەرڤەیی یاچەند نمونەکا ژ کومەلی مە دیار دکەت و دکتور نافع ئاکرەیی بڤێ چەندێ کتیبەکا جوان و بەرکەڤتی دانا دکتیبخانا کوردی‌داو ئەم وەك تێبینیەکێ دێ بێژین خوزی دکتور نافعی شیانێت (طاقە) خو بێت هوزانێ ڤەکیشاباناو کرباناسەر شیانێت خو دقادا چیروکێ‌دا ...

چنکو شیانا وی یا نڤیسینێ و بیرو هزرێت و بیناوی بو گرفتاریا پتر دیار دبیت ل چیروکێ‌داو چیروکێت دکتور نافعی ب شێوەکێ ئارمانجبەرتر و روونتر ژ هوزانێت وی هەلویستا وی خویا دکەن بەرامبەر هەمی بابەت و گرفتاریا کومەلی و مروڤایەتیێ .

دهوك 1983

«حەسیب قەرەداخی»

# چەردەیەك لە خەرمانی سۆفێتی ئیسلامی

رۆڵە گەر حەز دەکەی بیە شاکوڕ
پەندی مەحوی لەگوێ گرە وەکوو دوڕ
مەردی ئازادە قەت مەڕەنجێنە
«کُلُّ شَيْءٍ ولا شَتيمة حُرْ»

## چەردەیەك لە خەرمانی سۆفێتی ئیسلامی

سۆفێتی ئیسلامی دیاردەیەکی گیانیو (رۆحی) کۆمەلایەتی یە پشت بە تاقیوکردنەوە خۆیی یەکانەوە دەبەستێ «التجربة الذاتية» بەرهەمی کێشمە کێشو بیروباوەڕو پێوەندی کۆمەلایەتی ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی یەو زادەی مێژووی ئایینیو سیاسیو هۆشیاریو نەتەوەیی ئیسلامەکانە.

سەربەبەرەی فەلسەفەی میتافیزیکی یە. ئەم سۆفێتی یە گەلێك دەستنیشانو پێناسی بۆدانراوە کە لە کڕۆکی باوەڕەکەوە هەڵێنجێنراون، هەیانە دەقاو دەقەو هەشیانە کاڵا بەپێی بالایە، وەهەشیانە پێ لێهەڵکێشانو لاوەکێتی دەستی بەسەرا کێشاون. وایەکە یەکە باسیان دەکەم :

1 ـ سۆفێتی زانستێکە «عیلمێکە» مەرجو نیشانەی خۆی هەیە بناغەکەی هەستە لەقووڵایی دەروونەوە بە باوەڕی سۆفێتی. ڕێبازی ئەم زانستە زانستێکی بینینی نی یە (معلومات نظرية) بەڵکو دەقاو دەقەو دامەزراوە لەسەر سۆزی بەکوڵ لەحاڵەتێکدا کە نەفس دادەمێنێو دەستەوسان دەبێ.

2 ـ سۆفێتی وازهێنانە لەخۆپەرستی.

3 ـ سۆفێتی کەنار گرتنە لەهەموو بەرژەوەندی یەکی خۆیی

4 ـ سۆفێتی واز هێنانی (زهد) دەروونی یە لای دەوڵەمەندانو هەژارانو گومراهانو لەخواترسان.

5 ـ سۆفێتی کارێکی دەروونی یە کەس لێی بەئاگا نابێ .

6 ـ سۆفێتی سۆزێکی ڕاستەقینەی نێوان بەهێزو بناغە دامەزراوە ، لاوازی ڕێی تێ نابا، گومان سەری لێنادا

7 ـ سۆفێتی ڕاکشانە لەبەر دەرکی یارداو گوێ نەدانە بە دەرکردن.

8 ـ سۆفێتی ئەوەیە کەڕاستی «حەق» لەخۆتا بتمرێنێو لە خۆیدا بتژێنێ.

9 ـ سۆفێتی ئارام گرتنە لەبەر باری فرمانو بەربەرچی فرماندا.

10 ـ سۆفێتی لای ئێمەش پێی دەڵێن دەرویشی ـ دەرویش ـ لەدوو ووشە پێك هاتووە، (دەر) واتە ـ لە ـ (وێش) واتە ـ خۆ ـ تێکرا ئەبێ بە ـ لەخۆدا ـ (في ذاته)

11 ـ سۆفیتی خۆراهێنانو (رياضه) فەلسەفەیە ! راهینانی نەفسو گرتنەوەیەتی لەهەواو هەوەس ، کەوتنە سەر ڕێگەی زوهدە هەتا خۆی تەرخان بکات بۆ ئەو شتەی کە لەکارە دنیاییەکان بەرزترەو مەزنترە.

فەلسفەیەکە وەکو ئەو فەلسەفانە نی یە کەخەلك ئەیزانن و

لەسەر بنکەکانی مەنتیقو هۆیەکانی زانیاری دانەمەزراوە بەڵکو بەخشیشێکی خواییەو وە دەستی ئەو کەسانە ئەکەوێت کەنەفسی خۆیان ڕاهێناوەو پاراستوویانە.

جەریری ئەبو نصری سوراج ئەڵێ سۆفێتی بریتی یە لەوەرگرتنی هەموو ڕەوشتێکی بەرزو دەرباز بوونە لەهەموو ڕەوشتێکی نزم.

بەم خاڵانەی لەسەرەوە هێنامانە گۆڕێ سۆفێتیان بەگوێرەی بۆچوونی پیرە سۆفی یەکان خۆیان ناسی، لەگەڵ ئەمەشدا وەك ئەڵێن: سۆفێتی هەزارو یەك پێناسو نیشانەی تریشی بۆ دانراوە.

ئەی ووشەی سۆفی کە سۆفێتی لێ وەرگیراوە لەکوێ هاتووە ؟! بۆ زانینی ئەم مەسەلەیە ئەم سەرباسە دائەنێم.

ووشەی سۆفی (الصوفي) چی یەو لەچی یەوە هاتووە؟

1 ـ دەڵێن لەپێش ئیسلامدا تاقمێك هەبوون وازیان لەدنیا هێنابوو لە کەعبەدا خۆیان بووس دابوو پێ یان دەوتن (أهل الصفة) ئیتر ووشەی سۆفی لەمەوە هاتووەتە گۆڕێ.

2 ـ دەڵێن کەغەوسی کوڕی موڕ لەدایك بوو، دایکی بەخشی بەکەعبەو کردی بەبەندەی ئەلقە لەگوێی ئەوی‌و گولێك خوری بەست بەقژیەوە کە گوایا بەرخی خوایە ، ئەم بۆچوونەش بەسترا بە بیروباوەڕی قوربانی یەکەی (قۆچی) ئیبراهیم پێغەمبەرەوەو ووشەی سۆفی لەمەوە وەرگیراوە.

3 ـ هەندێك دەڵێن لە (صوف) واتە لە خوری یەوە وەرگیراوە، چونکە بەزۆری جل‌و بەرگیان لە خوری دروست ئەکرێ، ئەوەتا پێغەمبەر دەفەرموێ «ئەوەی خوری بپۆشێ‌و نانی جۆ بخوات‌و سواری گوێ درێژ ببێ، خۆبە زل زانینی تێدا نامێنێ» وەلێشی دەگێرنەوە کە دەفەرموێ «خوری لەبەرکەن و قۆڵتان هەڵکراوبێ‌و نیوەی زگیشتان بخۆن دەگەنە پایەی بەرزی ئاسمان».

4 ـ هەرچی وەك‌و ئەوەبێ کەگوایا ووشەی (صوفی) سوف لە (صفا) وەرگیراوە. ئەمە خۆ هەڵکێشانە لەلایەن سۆفی یەکان خۆیانەوە ، ئەوە ئەبوعلای معری دەڵێ:ـ

«صوفية مارضوا للصوف نسبتهم
حتى إدعوا أنهم من طاعة صفوا »

واتە سوفیانێك قایل نەبوون بووبریت نەوان لە «صوف» خوری یەوە وەرگیراون وەك وشە ، تاوایان لێهات بلێن بەخواناسی پاك بوونەتەوە.

5 ـ هەندێکیش دەڵێن لەوشتەی «سۆفیا» وەرگیراوە کە بە واتا حیکمەتە، تەشەر لەم رایە دەدرێ کەگۆیا سۆفیەتی کەبناغەی دیانە «مەسیحیەت» ە لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتۆتەدی ، بەڵام «سۆفیا» وشەی یۆنانی کۆنە.

**سۆفی یەکان کێن‌و چۆنن ؟**

سۆفی یەکان هەندێ کەسن کە خاوەنی بیرو باوەڕی ئەم سۆفێتی یەن کەزادەی بیرو باوەڕی ئیسلامەتی یەو دیاردەیەکە لەو دیاردانەی کۆمەڵانی ئیسلام‌و قۆناغە مێژوویی یەکانی‌و پیوەندیە ئابووری‌و سیاسی‌و ڕۆشنبیری‌و زانیاری یەکانی ئەم کۆمەڵگایە هێناویانەتەدی کەسانێکی ئازان‌و ڕوو هەڵمالراوون، بێ پەروان لەدەربڕینی ڕاستی‌و بیروباوەڕی خۆیاندا ئەگەر سەریشیان لەم پێناوەدا دابنێن ، ئەوان دژ بە عیلمانی یەتن ، ڕوونەکەنە خەڵکی هەرەمە ڕانماییان دەکەن بەرەو ژیان‌و پێویستی یەکانی ڕۆژانەیان‌و کاروباری ئاینی‌و کۆمەلایەتی یان بەزمانی سادەی خۆیان . خۆپاراستن لە نوقم بوون لەدنیاداری کاری گرنگی خۆیانەو ئەوکەسانەش کەدەستیان پیوە دەگرن واتە (مريد) . خاوەنی خەیاڵی شاعیرین‌و گەڕیدەی دنیای عەشق‌و خۆشەویستین، جیاوازی یەك نی یە لەنیوان توخمەکان‌و ئاینەکان‌و نێرومێ کاندا لای ئەوان لەهەر پایەیەکی کۆمەلایەتی دابن چونکە گرنگ لای ئەوان مرۆڤە، ڕاستی دەروونی یە ، پلەی نزیکی یە لەخواوە .

**سۆفی یە ڕاستەقینەکان لەهەموو خەڵك زیاتر بەتەنگ ئەوەوەن بگەن بە کماڵ‌و جماڵ، واتە پێگەیشتن‌و جوانی ... ئەو جوانی یەی کە ئاوازی بەنازە لەنیوان هەردوو ڕووی بوون «وجود»و یاسای هەبووندا ، لەنێوان ناوەڕۆك‌و ڕوخساردا، چونکە تەنها دۆستایەتی و یەکیەتی‌و تێکەڵاو بوونی ئەم دوو شتە شتی جوان دێنێتەدی . سۆفیە کان خاوەنی کەرەسەی دەربڕینی تایبەتی ئەدەبی تایبەتی‌و ژیانی تایبەتین‌و . مەیی تایبەتین. عەشق‌و شەیدابی‌و ناسەی دیدارو تووانەوە لەکیانی خۆشەویستیدا ڕێبازی خواپەرستی ئەوانە**

**به نووری بادە کەشفی زوڵەتی تەقوا نەکەم چبکەم ؟ !**
**به شەمعێکي وەها چاری شەوێکی وا نەکەم چبکەم ؟ !**

**وازهێنان ـ لەدنیاداری بەشێکە لەخۆیان چونکە ئەم وازهێنانە بەڵگەی ڕاستی‌و هێزی پێوەندی گیانی یە (الرابطة الروحية) . ئالێرەوە ئەتوانین بڵێین ئەگەر لەسۆفێتی دا کەم‌و کووڕی ببینین هەمووی خەتای دەروێشە بێچارەکان نی یە، چونکە**

ئەوان لەوەکەمترن کەهەموو ئەوکەمو کووڕیانە بخرێتە ئەستۆیان. ئەگەر پایەو چاکیمان تێدابینی هەموو مالی ئەو دەروێشانە نی یە چونکە دیسانەوە ئەوان لەوەکەمترن کەهەموو ئەوپایەو چاکێتی یەیان بخرێتە سەر شان..

**بیرو باوەڕی سۆفی یەکان :**

وتمان سۆفێتی ئیسلامی زادەی ئایینی ئیسلامە سەر بەبەرەی فەلسەفەی میتافیزیکی یە کەبریتی یەلە فەلسەفەی ئەودیو سروشت (ماوراء الطبیعة) ئەویش تێڕوانینی سروشتە وەکو شتێك کەلەحالی وەستانداپە،لەگەل باوەڕ نەکردن بەکێشمە کێشە ناوخۆییەکانی شتومەك وگوایا پێکادانی هێزەکان لە دەرەوەی خۆیاندا هوی گۆڕانە سەرەکی یەکانە نەك پێکادانی ناوشتەکان . جاکەلەم بۆچوونەوە بڕوانینە بیرو باوەڕی سۆفیەتی ئەتوانین لەم خالانەدا کەلەمەودوا دێن کۆیان بکەینەوە کەسەبارەت بەخواو خوایەتین . (الاله والالوهیة) .

أ ـ خوای گەورە بەتاکە بوون ناسراوە بەهۆی هیچ شتێکەوە نەبووەو هۆیش نی یە بۆهیچ شتێك بەلکو خۆی بۆخۆی هەیە . « الحق تعالیٰ موصوف بالوجود المطلق ، لیس معلولاً بشئ ولا علة بل موجود بذاته » .

ب ـ بوونی خوا تاکە بوونێکی واقیعی یە ، دەوروبەرو هەرچی هەیەو دیارەو دیاردە مەتریالی یەکانیش هەموویان شەپۆلێکن لەشەپۆلەکانی ئەو .

ج ـ بوون (الموجود) واتە « خوا » عەقڵی گشتی یە ، دەرامەت دارە ، هەموو شتێك لەودایە ، هیچ شتێك جێگەی ئەوی تێدانابێتەوە ، لەهەموو شتێك بەئاگایە ، بەسەر هەموو شتێکدا دەستدارە چونکە هەموو شت بیرێکە (فکرة) لەبیرەکانی ئەو .

د ـ خواذاتێکە « بوونێکە » کەوا لەذاتی « بوونی » هەموو هەبووەکاندایە .

هـ ـ حەق کەذاتی خوایە لەپشت حەقیقەتەوەیە (راستی) ئەم حەقیقەتە نزمترە لەحەق کەخوایە ، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ بەپێی ئەمڕایە کەحەق دوو ماکەو یەکێ خوا ، یەکەم ماك لەدلی بەندەکاندا جێی دەبێتەوە بەلام دووەم ماك لە هیچ شتێکدا جێی نابێتەوە ، خۆی خۆیەتی و لەهەمان کاتدا هەموو شتەکانیشە .

و ـ حەقیقەتی گشتی واتە (خوا) کەبۆ حەق و بۆ جیهانیشە بەبوون و نەبوون و بەپەیدا بوون (حدث) و هەربوون « أبد » بێ ناناسرێ . لەلای سۆفیەکان حەق بریتی یە لەزاتی ئیلاهی لەبووندا واتە (الوجود المطلق) لێرەدا بەپێویستی دەزانم دەربارەی ئەو فەلسەفانەو ئەو ڕێبازانە بدوێم کەبەدەوروبەری ئایندادێن و دەچن لەخوایەتی ئەدوێن .

**یەکەم : ڕێبازی گەوهەری تاك (الجوهر الفرد)** پوختەی ئەم ڕێبازە ئەوەیە کە عەقلێکی بەڕێوەبەر هەیە کەهۆی یاساو ڕێکخستنی ئەم جیهانەیە « جیهانی مەتریالی » کەهەر خۆی تواناو عەقل و کارو جم و جۆڵدەبەخشێ . ئەم عەقلە یائەم گەوهەری تاکە یەکەم سوورێنەری مادەو رێکخەریەتی لەوتەمو مژەی (العلماء) کە گوایا ڕەسەنی مادەیە . بەلام دروست کەری مادەنی یە .

**دووەم : ڕێبازی خوایی یەکان (المؤلهة)** : پوختەی ئەمیش ئەمەیە کەخوا هۆی یەکەمە (العلة الأولی) هەموو شتێك لەوەوە هاتۆتە دی .

**سێیەم : ڕێبازی سەر بەعەقلانی یەکان** : پوختەی ئەم ڕێبازە ئەوەیە خوایەك هەیە . چاودێری هەمووشتێکەو دەیانبات بەڕێوە بە ویستێکی ئازادنا ، بەلکو لەمکارەداری بەجێی چەندیاسایەك دەکات کە گۆڕینی نی یە .

**چوارەم : ڕێبازی حلول « تێکەلاو بوون » وەکو حەلاج دەلێ**

« أنا من أهوی ومن أهوی انا
نحن روحان حللنا بدنا
فاذا أبصرتنی ابصرته
واذا أبصرته أبصرتنا »

واتە منئەو کەسەم کەخۆم خۆشم ئەوێت و ئەوکەسەی کەخۆشمئەوێ منم ، ئەگەر منت بینی ئەوت بینیوە ، ئەگەر ئەوت بینی منت بینیوە .

هەروەها بابە تایەریش دەلێ :

« ئەگەر دل دلبەرو دلبەر کدوومە
وەگەر دلبەر دل و دلرا چەنووم
دل و دلبەر وەهەم ئاوێتە بینیم
نەزونم دل کزو دلبەر کرووم »

ئەم رایە خزمایەتی یەکی زۆری هەیەلەگەل « فەلسەفەی وحدة الوجود » دا کە بـریتی‌یە لەیـەکێتی سروشت و عـەقل بـەبێ ئەوەی کۆبکرێنەوە لەیـەك عەقـلی گشتیدا کـەدەست داربێ بەسەر کەرتەکانی خۆیدا پێناسـەکانی ئـەم عەقـلی گشتی‌یە ئەمانەن : ـ

1 ـ دوایی نەهاتن و نەگۆران .

2 ـ خاوەنی سەربەستی‌یەکی تەواو واتە ئازاد .

3 ـ عەقلی گشتی ئەندامە هەست دارەکان (الحواس) ناناسێ ، چونکە عەقلێکی رووتە (مجرد) بەسەر بیرەکانی (أفكار) خۆیدا چەماوەتەوە .

4 ـ سـۆزی بەکـەڵك و نابـەکەڵکی نی‌یـە (العـاطفـة السلبیـة والأیجابیة) چونکە سۆزی وا بەرهەمی گەیشتنە بەواقیع و عەقلی گشتی واقعی نی‌یە لەدەرەوەی خودی خۆیدا . پیرە سۆفی مەزن ابن الفارض لەبارەی یەکێتی بوونەوە « وحدة الوجـود » ئەڵێ : راستی‌ی خـوا لەخۆی دایـە لەهەمـوو دیاردەکانی بووندا ئەم گەردوونە دوو نەمادی‌یە بەهەموو ئـەو شتـانـەوەی کـەتێیـدایـە خـۆی خـودی خـوایـەو ماهیەتەکەیشی ماهیەتی خوایە بوونەکەیشی بوونی خوایە ، خواوەندیش هەمیشە لەنیگای خەڵقا خۆی دەنوێنێ و زاتی خۆی بەزاتی ئەوان ئەچەسپێنێ . سۆفیش لەیەکەم هەنگاو یا لەسەر ئەوەیە کەخوا خودی خەڵقی خۆیەتی .

ففي الصحو بعد المحو لم اك غيرها

وذاتي بذاتي إذ تحلت تجلّتْ

وأن دُعيتْ كنتُ المجيبَ وإن اكن

منادىً أجابت من دعائي وكبّتْ

واتـە لە کاتی هـۆشیـاری وبێ هـۆشیمـا من هـەرئـەوبـووم « زاتی‌خوا » کەزاتی منە لەگەڵ زاتی خۆمدا کەتێکەڵاو بوون خوا دەرکەوت ، ئەگەر داوا لەخوایش بکرێ من وەلام ئەدەمەوە ئـەگەر منیش بـانگ بکـرێم ئەوا خـوا وەلام ئەداتـەوەو کار جێ‌بەجێ ئەکات*

مەحوی ئەڵێ :

شەوێ لەیلا بە مەجنوونی دەوت : بنوارە حاڵی خۆت

بە خۆرایی کە چۆنت‌دا بەبا عەقڵ و کەماڵی خۆت !

جووابی دایەوە مەجنوون ، ئەگەر طاقەت ببێ لەحظێ

لەناو ئاوێنەدا بروانە حوسن و جەماڵی خۆت

عبدالکـریمی کوری ئیبـراهیمی جیلانی کەساڵی 830 کۆچی مردووە ئەڵێ : ـ

**لي الملك في الدارين لم أرفيهما**

**سواي ، فأرجو فضله ، أو اخشاهُ**

**وقد حزت انواع الكمال وانني**

**جمال جلال الكل ، ما أنا الاّ هو**

واتە هەردوو دنیا هی منە جگـە لەخۆم کـەسێکم تیا نـەدیوە کەداوای فەزڵی لێ‌بکەم یالێ‌ی بترسم . من هەموو چەشنەکانی کەماڵم وەدەست هێناوە ، خۆم جوانی‌ی بوزرگی هەموو شتێکم من جگە لەخواهیچی کەنیم . غەزالیش ئەڵێ : « لا إله الا الله » خوا بەیەك ناسینی رەشەخەڵکەو (لا آله الا هو) خوا بەیـەك ناسینی کەسانی تایبەتی یە (خاصة) یەکەم واتە (لا إله الا الله) خوایەتی بەتەنها بۆ خوا ئەچەسپێنی و لەغەیری خوای بەدوور ئەخات و بەم پێ‌یە بەبوونی کردگارو خەڵق ئەچـەسپێنێ واتە چەسپاندنی دوو بوون (موجودین) کەیەکێکیـان لەوی تریـان جیاوازە بەلام دووەم واتە (لا إله الا هو) یەك بوون دەچەسپێنێ کەدیاردەکان و شێوەکانی جۆر بەجۆرن وپێیان ئەوترێت خەلق .

**بیرو باوەری سۆفی‌یەکان سەبارەت بەهۆش (عەقل)** :

بیروباوەری سۆفی‌یەکان سەبارەت بەهۆش لەم سێ خاڵەدا باس دەکەین :

1 ـ سۆفیتی رێبازێکی بەجم و جۆڵە ، باوەری بەگـۆرانی روو بەچاکـە هەیـە ، هیچ کێشێکی گـرنگ بـۆبەڵگـە منطقی و عەقلی‌یەکان دانانێ و بەڵگەکانیان بەگەورە نازانێ ، چونکە سۆفیەتی پشت بەزیکرو چاوتێبرین و تـاقی‌کردنـەوەو ئەو خـەوانە دەبـەستێ کەلەپـایەی حـەقیقـەتـدان و پـەرچ نادرێنەوە .

2 ـ لای سـۆفی‌یەکـان عەقـڵ رێگەنی‌یـە بۆ زانینی نهێنی‌یـە خواییەکان بەڵکو رێگەی عەشقی خواییە ، چونکـە وەکوو (عەتار) دەڵێ عـەشق لەگەوهـەرەو پێناسی گـەوهەرت پێ دەناسێ . رووناکی بەهۆی رێگەوە نابینـرێ ، بەڵکـو رێگە بەرووناکی ئەبینرێ .

3 ـ لەبەرئەوەی کـەجیهانی ئیلهـامی سۆفی جێگـەی گەلێـك دەلالاتی تێدا ئەبێتەوە

کە لە ووشەو ئاخاوتن و دەنگ و رووداوە سروشتی‌یەکان وەری دەگرێ . ئیتر بەرانبەر بەهەستە رووتەکانی

خۆی (الحاسه المجردة) نیوه کپ کراوێکـه بەهـۆی نقوم بوونی دەروونی (الأغراق الذاتی) خۆیو دوورکەوتنەوەی لە جیهانی هەست پێکراو ، کە لێرەوە عەقل ئەکەوێتەکار .

**سۆفێتیو مرۆڤ** لەبەرئەوەی کە سۆفێتی پشت بە ڕەشە خەڵك دەبەستێو بەزمانی سادەی ئەوان دەدوێو لە تەلی سـۆزی ئـەوان ئـەداتو هـەمیشـە چاوی لەوەیـە کـە عـاشق بـۆ خۆشەویستی خۆی زیاتر کۆبکاتەوە ، و لەبەر ئەوەی خۆی لە خۆیدا دیاردەیەکی کۆمەلایەتی یە ، چـەند هـۆیەکی تـایبەتی هێناویەتە دیو لە مرۆڤەوەیەبۆ مرۆڤو سەرچاوەی ئەم کێشمە کێشەش ئەندێشەو خەوی مرۆڤ خۆیەتی ، ئیتر سۆفیەتی ڕێز نە مرۆڤ دەگرێو هەموو کاروباری خۆی لەسەر شـانی ئەو داناوەو ئەو پێناسانەی کە سۆفیەکانی پێدەناسرێن تەنها لە مرۆڤدا کۆدەبنەوە ، وەك پیاو چاکیو هەژاریو خۆنەبەستنەوە بـەکـارێکی دیـاری ، بـەخشینی هـەسـتو نـەست بـە خۆشەویست .... هتد ئەوەتا سۆفێتی دژ بەجیاوازی ڕەگەزو ڕەنگو ئایینە تەنـانەت لای هـەندێـك لە سۆفیـە مەزنـەکان جیـاوازی نییە لە نێـوان گونـاه بارو پیـاو چاکـدا چـونکـە هەردووکیان مرۆڤن ، چ ئەویانو چ ئەمیان فەرمانی خوا بەجێ دەهێنن . لێـرەوە خزمـایەتی سـۆفیەکـانو جـەبـریـەکـان دەردەکـەوێ ، بنەمـای مەزهـەبی جەبـریـەکـان ئەمـەیـە : دورخستنی کاری تەواو لە بەندەگانی خواو دەیدەنەوە پاڵی خوا چونکە بەندە بە توانا ناو نابرێت ، بـەڵکو پـاڵ پێوە نـراوە لە کردارەکانیدا واتە مجبورە بێ توانایە هەڵبژاردنو چارەنووس بەدەستی ئەو نییە ، خواوەند وەك چۆن کردار لە زیندەوەرانو نا زیندەوەران دروست ئەکات ئاوەهایش لەوا کردار دروست ئەکات ، ئەم کردارانەیش ئەداتە پاڵ بەندە بەمەجال وەك بڵێی دار بـەریگرت ، ئـاو ئەڕوا ، ڕۆژ هەڵدێ . جەبری لەسەر ئەوەیشەکە جەبر پێویستە بۆ یەکانی خوا ئەم یەکانە ییشە بەبێ جەبر ڕاناوەستێو جێ ناگرێ چونکە ئەگەر وانەبێ ئەبێ دروست کەرێ واتە خالقێ بۆ ڕوودا وەکان دابنێین بێجگە لە خوا هەرچی بوێت بیکاتو هەرچی نەوێت نەی کات ئەمەش هاوبەش دانانێکی ئاشکرایە بۆخوا ! ئەگەر بێتو دوای مێژووی پیرە سۆفیەکانو ڕێبازی سۆفیەتی بکەوین . بەدەیان چیـرۆكو ڕووداوی وادەبینین کـە هەمـوویان سـەر سوڕێنەرن سەبارەت بە سۆفێتیو مرۆڤ ، گەلێك لەو پیرە بەناو بانگانە خۆیان لە پێناوی مرۆڤدا بەخت کردووە ، وهیچ کۆیان لەوە نـەکردووە کـە مرۆڤ بکـەن بەعـاشقی ڕاستـەقینـەی بیروباوەڕەکەیانو ڕای بگرن لە ڕووی هەمـوو عەقـڵو شكو شەرع بازوو شەڕ خوازەکاندا .

**خۆشەویستیو عەشقی سۆفێتی** ئـەوەی کە بێگـومانـە لە ڕێبازی سۆفێتیدا ئەوەیە کە خۆشەویستیو عەشق کرۆکی ئەم ڕێبازەیە ، هەرچی بیرو باوەڕی سۆفێتی هـەیە هـەمووی بـە دەوروبەری خۆشەویستیو عەشقدا تەنراوە ڕیازەی نەفس ، وازهێنان لەخۆشی یەکانی دنیاو خۆبـەختکردنو خـۆتەرخـان کردن لەڕێگەی بیرو باوەڕدا ، گەوهەری مەسەلەکە هەمووی هەرخۆشەویستیو عەشقە*

لەبەر دەرگاهی عیشقا ، یەکسەرە هەرکەس سەری دانا
ئەگەر پەتیارەیەك بوو ، بوو لەسەد عەللامە داناتر

چونکە خۆشەویستیو عەشق بۆ چوونن بۆ توانەوە لە زاتی خۆشەویستدا کە خوایە . لە یەکێتی بووندا بەوە قایل نین کە بوونی خۆیان جیابێ لەبوونی خەڵكو بەوەش قایل نین کە بە شەیدای خوا بناسرێنو بەس ، بەڵکو ئەڵێن ئێمە بەشێکین بـەستراوین بـە حەقیقـەتی هەربـووەوە « ئەزەلی » وەئەو حەقیقەتەش بوونی پێویستە ، کـەخوایـە . بوونی ذاتی خواش بوونی مەخلوقـاتە . هـەموو ذاتـەکان لە نەبووندا بێ جمەبوونو ئەزەلی و ئەبەدین ، بوونی حەق کـە خوایە ڕژاوە بەسەریاندا ، کەواتە بوونیان بوونی خوایە ، بەلام ذاتی یان ذاتی خوانی یە ، بوونی بەدی هاتووەکان (المحدثات) خودی بوونی کردگارەو هیچی تر ، ئەمو ئەوی تر (غیر وسوی) لە هیچ لایەكو بەهیچ کلۆجێ نین ، بەندە کاتێك ئەمو ئەبینێ کە بەرچاوی گیرابێ ، کە پەردە لەسەر چاوی هەڵگیـرا ئەوکـاتە ئەبینێ کە ئەم ئەونییەو مەسەلە ئاشکرا ئەبێ ، واتـە خۆی لەخوادا ئەبێتەوە بەیـەكبوون (أتحـاد) یابـە تێکەڵ بـوونو توانەوە ، یـەك بوونیش بـریتییە لەبینینی تـەنها بـوونێکی موطلەق (وجود) لەو دیاردەیەوە کە بوونی هـەموو شتێـك بە بوونی ئەو تاکە شتەو لە خۆیاندا نین . نەك لەو دیاردەیەوە کە بڵێین ئەو شتانە بوونی تایبەتییان لەغـەیری خـوادا هەیـەو لەگەڵ خوادا یەك دەگرن . تێکـەڵبوونو تـوانەوەیش واتـە (الحلول) دووچـەشنە : تێکـەڵ بوونو تـوانـەوەی دووشت لەیەکدا کە هەر کاتێ ناوی هەرکامیانت برد ئەوا لەهەمان کاتدا

ناوی ئەوی تریشیانە وەکوو گوڵاو . یاتێکەڵ بوون و توانەوەی دووشت کە لایەنی یەکتری بن وەکوو مەی و پێك ، ئاو و جام . هەندێکیشیان دەڵێن ئێمە شەرەفبارین بەوەی پێوەندی ئێمەو خوا پێوەندی عاشق و مەعشوقە ، هەندێکیشیان مەسەلەی خۆیان بەتەنها لە عاشق و مەعشوقیدا نابینن ، بەڵکو سۆزێك دەبینن کەبریتی یە لە سۆزی هەند بۆ هەموو « الجزء للكل » :

**بشنەو ئەز نەی چون حکایەت میکونەد**
**وەز جودایيها شکایەت میکونەد**

واتە گوێ ڕاگرن بۆ شمشال چۆن حکایەتێ دەکاو چۆن هاوار دەکات لە دەست جیابوونەوەی لە قامیشەلان .

**ئەو نەیجەیەم قامیشەلانی تۆ دایکی ڕیشەی منە**
**ساتێ لە تۆ بمبرنەوە نالەی دنیا پیشەی منە**

ئەگەر ونبوون لە زاتی خودا گرنگترین شت بی لە لای شۆخی تەواو ، ئیتر ئەگەر ئەم ونبوونە ونبوونی هەند بێ لە هەموودا ئەوا ونبوونی عاشق لە مەعشوقدا ـ دلدارە لەیاردا ـ بە هەشتیشیان بۆیە دەوێ چونکە وەك دەڵێن خوا لەوێ تەجەللا دەکات و دەردەکەوێ ئەینا خۆ ئەوان لە نزاکانیاندا دەڵێن : خوایە ئەگەر دەزانی لە ترسی ئاگری جەهەننەم تۆ ئەپەرستم ئەوا بەو ئاگرە بمسوتێنەو ئەگەر وا ئەزانی لەخۆشی بەهەشت تۆ ئەپەرستم ئەوابێ بەشم کەلێی ئەگەر ئەزانی پەرستنی تۆم تەنها لەبەر خۆشەویستیەو لەبەر سۆزی بەکوڵە بۆ تۆ ئەوا ڕێگەم بدەو چیشم بەسەر دێنی ئارەزووی خۆتە ، شانم لەبەر بارتا ڕاگرتووە بەهەموو ڕەزامەندی یەکەوە*

مەحوی ئەڵێ :

تێ دەگا هەرکەس بکا فەهمی ڕموزی مەعنەوی
هیجرو وەسڵە نارو جەننەت ئایەتی لا یستوی
کێوی غەم ، وادی جەفا طەی کردنە ئەشراطی عیشق
باکی هەورازو نشێوت کەی دەبێ گەر ڕەهرەوی

، ئەوەتا حەلاجی شەهید ئەڵێ لەمەستی خۆشەویستیدا مرۆڤ دەگاتە ئەو پلەیەی کە هەموو جەستەی نوقم دەبێ لە خۆشەویستیدا و هیچ شتێکی دی نابینێ ، زاتی حەق کە خۆشویستنە دەستی گرت بەسەر شاری دڵدا لە هەموو شتێکی کە چۆڵی دەکات و ئەگەر بووبە هاوڕێی هەرکەسێك لە هەموو شتێکی کەی بێ ئاگادەکات .

**مزجت روحك في روحي كما تمزج الخمرة بالماء الزلال**
**فاذا مسّك شئ مسّني فاذا انت انا في كل حال**

واتە گیانت تێکەڵ بەگیانم بووە بەچەشنی تێکەڵاو کردنی مەی لەگەڵ ئاوی گەواردا ئەگەر شتێ لە تۆبکەوێ ئەوا لە منیش کەوتووە ، ئیتر تۆ منی لە هەموو حاڵێکدا .

**کە بووی بەیار من عاشقم دنیا بە دواتاتەی ئەکەم**
**چویتە هەر بادێ مۆنمێ منیش ڕوو لەبادەی ئەکەم**

ئەگەر مەسەلەکە وانەبێ لای سۆفیەکان چۆن ئەڵێن «کون» واتە ئەم جیهانە ناتەواوەو حەقیقەت نی یە بۆیە ئێمە بەدوای پڕ کردنەوەی ئەم ناتەواویەدا دەگەڕێین و هەوڵ ئەدەین بگەین بە پایەی کەماڵ و ئەمەش تەنها بەگومبوون دەبێ لەجیهانی حەقیقەتی بێ پایاندا بەرەو دیاری خۆشەویست کە تەنها ئەوێ جێگەی پاکی و بێگەردی یەو هەموو دژوارو نەگونجاوەکان لەوێ یەك دەگرنەوەو ڕێك دەکەون .

**پلەی سوفێتی**

ئێمە کە هاتینە سەر ئەوەی سۆفێتیمان بەڕێبازێکی فەلسەفی داناو مەرج و شێوازو ناوەڕۆکمان بۆ دەست نیشان کردو پێناسمان بۆ داناو وتمان سۆفێتی زانیاری یەو لە دەروونەوە هەڵ دەقوڵێ و دەنگی سۆزی بەکوڵ و ڕاهێنانی نەفسەو خۆ ڕاگرتنە لەبەر باری ئازاردا لە پێناوی پێگەیشتنی خۆشەویستا ، ناچارین ئەبێ بگەڕێین بە شوێن پلەی ئەم فەلسەفەو زانیاری و سۆزو هەست و شەیدا بوونەدا . هەر لە « سری سقطی » وە هەتا ئەو کاتەی کە کار نەترازابوو سۆفێتی نەبوو بوو بەلەوەرگای تەمەڵ و تەوەزەل ونەخوێندەواران و بێکاران و مفتە خۆران ، ئەو پلانەو خاوەنی پلەکانیش دیار بوون ، خەڵکی وەك ڕێنما تەماشایان دەکردن و دەرسیان لێوەردەگرتن و ڕێ بەجێی ئەوانیان دەکردو شوێن قەوڵ و قیلیان دەکەوتن وەك مجتهدی ئایینی

**وە ئەمانەش پلەکانن :** ـ

**1 ـ ڕەشە خەڵکی سۆفی کە ئێمە پێیان ئەڵێین دەرویش یاسۆفی .**

**2 ـ ئەخبار ئەمانە کوا یا ژمارەیان هەموو کات لە 300 کەس کەمترنی یە .**

**3 ـ ئەبدال هەرگیز نابێ دنیا لەمانە خاڵی بێ ژمارەیان هەفتاکەسە چل کەسیان دەبێ لە شاماتدا بێ و ئەوانی**

که له هەموو جیهاندا .

٤ – ئەبرار یائەوتاد واتە وکو مێخ وان بۆ لەنگەر گرتنی جیهان هەموو شەوێك بەدەوری دنیادا دەگەڕێن‌و ژمارەیان چوار کەسە .

٥ – نوقەبا ئەمانە پلەیەك لە ئەبرار لە پێشترن ژمارەیان سێ‌کەسە .

٦ – دوایین پلە غەوسە یاقوتب ـ واتە وەك بارانی رەحمەت یاوەك بلوسکەی ئاش هەموو دنیا هەرچی تێدایەو هەرچی تێیدا روو ئەدا خولی دەوری ئەو نەوەن‌و ئەو ئەیانگێرێ . راگرتن‌و رەها کردن‌و چاودێری جێ‌بەجێ کردنی کاری جیهان‌و دامەزراندنی بەتواناو پایەی نەوەوە بەستراوە ، ئەم غەوسە یاقوتبە لە هەر دەمێکدا یەك کەسە . لە دەست نیشان کردنی ئەو پلانەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە مەسەلە کە چەند گرنگەو چۆن بۆ هەر پلەیەك پایەو برەوی خۆی بۆ دانراوە لەشێوە رێکخستنێکی تەواو بتەوو دامەزراوەو بۆئەوە دەشێ بلێی لە توێی ئەم رێکخستنە دا لەوانەیە لە کاتی خۆیدا مەبەستێکی تریش بووبێ ئەویش وەدست گرتنی حوکم‌و دەستەلاتە ، بۆیەکیش کە سۆفی‌یە مەزنەکان لەپلەی بەرزەکاندارازی خۆیان ئاشکرادەکردو خۆیان دەهاویشتە باوەش رەشە خەڵکەوە ئیتر حوکمران‌و دەستەلات دارەکان لەرزیان لێ دەهات‌و زنوقیان دەچوو ، هەزار نارەوایی‌و بوختان‌و درۆو دەلەسەو فتوای پروپووچیان دەهێنایە گۆڕ بۆ لە ناوبردن‌و کوشتنی یەکێك لەو پیرانەو نموونەشمان حەلاج‌و شبلی‌و غەیری ئەمانیشە . بەلام کە کار لە کار ترازا ـ وەکوو وتمان ـ وپێوەندی کۆمەلایەتی گۆڕاو دەوڵەتی ئیسلام خان خان کرا ، ئەوکاتە دەستەلات داران لە بیریان مابوو کە ئەبێ ئاگایان لەوەبێ حەلاجێکی کە پەیدا نەبێ‌و کێچ نەخاتە کەوڵی ئاو ریشمینی ئەوانەوە ، بۆیە ئەمان زۆرزانتر بوون ، دەستیان کرد بەکڕین‌و مامەلە کردن‌و رێك‌کەوتنی ژێر بە ژێر هەتا کار هاتە سەر ئەوەی کە بینیمان‌و دەی بینین ، بیستمان‌و دەی بیستین ئیتر پێ‌و دانی سۆفێتی تێکچوو وەك زۆر پێ‌و دانی کەی ئەم جیهانە جەنجاڵە .

**پەرستن‌و حالات لە سۆفێتیدا** بێ‌گومان پەرستن کە تایبەتی‌یە بۆ ذاتی خوا رێگەی سۆفی‌یەکانە بۆ بیر لێ کردنەوەی قوول لەوزاتەو خۆشەویستی ئەوو پاك کردنەوەی دەروون‌و بەرچاو بەسۆزی خۆشەویستی ئەو و پێغەمبەری ئەوو ، رێبازی سۆفێتی لەم بوارەدا دیارو ئاشکرایە ، دەگێڕنەوە زۆر لە سۆفی‌یە مەزنەکان رۆژی وابووە زێدەتر لە هەزار رکات نوێژیان کردووەو بە رۆژ بە رۆژو بوون‌و بە شەو ئاگادارو هۆشیار تابەیان روو لە خوای خۆیان بووە وەنەوزێکیان نەداوە ، چونکە ئەوان بەوە قایل نەبوون بەشەیدای خوایان بزانن وەبەس بەلکو چوونەتە حالێکەوە کە خۆیان بەبەشێك لە خوا زانیوە وە بەهۆی ئەم خۆشەویستی‌یە بێ‌هاوتایەو ئەم قوولبوونەوە لە بیرکردنەوە داو ئەم شوڕبوونەوە بۆ ناو ناخی خۆو ئەم ریازەتە نەفس‌یەوە گەلێك حالاتیان بەسەرا دێ کە لەمەو دوا باسیان دەکەم‌و بوون بەهۆی ناکۆکی‌یەکی تەواو لە نێوان شەرع خوازەکان‌و ئەواندا ، بە تایبەتی سەبارەت بەشی کردنەوەی ئایەتی قورئان‌و فەرمایشی پێغەمبەر ، گوێیان نەداوەتە دەق‌و واتای دەقەکان بەلکو رێگای تأویل‌و پەنجە بۆ راکێشان‌و هێمایان گرتووە لە لێکدانەوەو شی کردنەوەی ئایەت‌و فەرمایشدا ، دژ بە عیلمانی‌یەتی شەرع‌و پەندو ئامۆژگاری‌یە راستەو خۆکانن ، دژ بەوەن کە خوا لەهەموو سۆزو بەزەیی‌یەك بەدوور بگیرێ . ئەوەتا عبدالکریمی جیلانی ئەلێ : من باوەڕم بە ئاگرو بەهەشت هەیە ، بەلام هەرگیز لام وانی‌یە ئەوانەی لە ئاگردان لە سزادابن بەلکو ئەوانیش چێژوەر دەگرن وەك بەهەشتیەکان‌و لە شیعرەکانیدا خەلك فێری دل خۆشی‌و دەم بەخەندەیی دەکات‌و فێریان دەکات کە پەرستن‌و یاخی بوونی ئەوان یەك شتەو بۆ رەزامەندی خوایەو باری گرانی پەشیمانی‌و سەرکزی یان لەسەر هەلدەگرێ ، چونکە ئەلێ قوول‌کردنەوە لەپەشیمانیدا حوکمی دارووخان‌و کاولکردن دەدا بەسەر نەفس‌و مرۆڤدا . هەروەها ئەلێ ئێمە چۆن بژین ئەگە ردنیا لە ئارەزوومەندی‌و رابواردن خالی بێ ، چۆن دنیا خۆش دەبێ بەبێ رێ بەجێی فەرمانی خوا بەیاخی بوونیش بێ ، ئایاعەقل چۆن عەقلێك دەبێ ئەگەر یاخی بوون‌و شۆرش‌و دەست وەشاندن نەبێ . لە سفری ئەیووبدا هاتووە ئەلێ زۆرداری گەورەترین گوناهە بەلام چاوی زۆرلێکراوان دەکاتەوە بۆشۆرش‌و تێکۆشان مەزنترین نەفس ئەو نەفسانەیە کەدەستیان لە ملی شووشەی بادەی رق‌و کینەو خۆشەویستی‌و شەیدا بوون کردووە ، بەرزترین عەقل ئەوەیە کە بجەنگی

لەگۆرەپانی گومان و باوەڕدا ، بەهێزترین گۆرانی و سروود ئەمانەن کەناڵەی بێچارەکانن ، ئەو بێچارانەی کەرووبەرووی کێشمە کێشی زەمانەوە وەستاون ، مەزنترین پیاوان ئەوانەن کەگیانی خۆیان لەدەریای شەهوانیەتدا تەرکردووە*

مەحوی ئەڵێ :

بە نۆشی جانی وەردەگرم پیاڵەی زەهری هەر نێشێ
بە دەردی دڵم بچم گەر بێ بەجەوری تۆ دڵم بێشێ

هەتا ئەڵێ :

خودا گرتوو ، دڵم ، چۆتن بەگژ شۆڕو شەڕی عیشقا
بە نەصی ئایە ، ئەفلاک و زەمین ئەم بارە ناکێشێ

کەلەم ڕوانگەیەوە نیگایەك بگرینە پێوەندی نێوان سۆفیەتی و شەرع ئەوکاتە دەزانین چ دژواری‌یەك لەنێوانیاندا هەیە ، سۆفی‌یەکان ئەڵێن ئەهلی شەرع بەهەشت خوازن ، واتە بەکرێ خوا دەپەرستن و ڕێبەجێ‌یی فەرمانی دەکەن بەلام ئێمە عاشقی خواین عاشقی خاوەنی بەهەشتین و خۆشەویستی خوا وامان لێدەکات جگە لەمەعنا هیچی‌تر نەبینین ، واتە گوێ نادەینە ڕێ بەجێ‌یی کردنی دەقە شەرعی‌یەکان و ئەحکامە ڕەمەو زەقەکانی ، ئێمە بێچارەیی گوناهبارمان لەلا گەورەترە لەبایی بوونی بەندەی خوای کارگوزار ـ المطیع ـ و خۆشەویستی‌ی خوا بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ بکاتە سەرفرازی لەهەر ڕێگایەکە وەبێ .

| | |
|---|---|
| لما علمتُ بأن قلبي فارغ | من سواك ، ملأته بهواكا |
| وملأت كلي منك حتىٰ لم أدع | فيَّ مكاناً خالياً لسواكا |
| فالقلب منك هيامه وغرامه | والنطق لاينفك عن ذكراكا |
| والطرف حيث أجيله متلفتاً | في كل شئ يجتلى معناكا |
| والسمع لا يصغي الى متكلم | الا اذا ماحدثوا بجلاكا |

کەزانیم دڵم جگە لەتۆ هیچی‌کەی تێدانی‌یە ، پڕم کرد لە خۆشەویستی تۆ ، ئەمن گیانی خۆمم بۆ تۆ پڕکردووە بەچەشنێ جێگەی کەسی تێدا نەماوە ، شێتی و شەیدایی دڵم هەر بۆتۆیەو زمانیشم لەناوبردنت ناکەوێت چاویشم بەهەر لایەکدا دەگێڕم هەر دەڕوانێتە ئەو شتانەی کەمەعنای تۆیان تێدا دەردەکەوێ ، گوێشم وتەی کەس نابیسێ ئەگەر باس باسی تۆ نەبێ .

دوای ئەو کەرتە باسە دەتوانین بێینەوە سەر مەسەلەی حاڵی سۆفی‌یەکان کەبریتی‌یە لە چۆنی‌یەتی‌یەکی تایبەتی دێت بەسەر سۆفی‌یەکاندا لەکاتی ذکرو بیرکردنەوەو ڕووکردنە پیرو بیستنی مەناقیب و نرکەی ئەواندا :

**حاڵی یەکەم** ـ وجد ـ ە کەڕوونبوونەوەی گیان و دەروونە ، سۆفی تێیدا نوقم دەبێ و لەهەست و هەست کردنی دەکەوێ ، و نیشانەشی گۆرانی تایبەتی و هونراوەی عەشق و شەیدایی خواو پێغەمبەرو پیرە ، لای ئێمە پێی دەڵێن سۆز کە لەدڵ و دەروونەوە دێ و ئەم حاڵە پێشی دەڵێن حاڵی (سەماع) .

**حاڵی دووەم** شەتەحە (شطح) ئەمیش بریتی‌یە لە ـ وەجد ـ ێکی سەرەوڕێژ کردووی بەهێزوو هەڵچوو بەکوڵی بێ‌پایان ، تائەکاتە ئەو ڕادەیەی ـ وەکو ئەبو یەزیدی بەستامی ئەڵێ : خوا جارێکیان منی هەڵگرت و لەبەردەمی خۆیدا وەستانمی ، وتی ئەبو یەزید خەڵك دەیانەوێ بت‌بینن چونکە خۆشیان دەوێی ، منیش وتم دەتۆیش بەخوایەتی خۆت ئارایشم دەو جل و بەرگی یەگانەیی خۆتم لەبەرکەو هەڵم برە تائەگەمە پایەی یەکتایی خۆت . کە خەڵك بینیمیان ئەڵێن خوامان دیوە ئەوکاتە تۆ ئەویت و من لەوێ نیم

**حاڵەتی سێیەم** ـ فناف الله . (نەمان لەذاتی خوادا) ئەمەش حاڵی سۆفی‌یە کاتێ کەدەگات بەم حاڵە ئیتر جگە لەخوا هەموو شتێك لای ئەو گومە ، ڕازی دڵ و بیروباوەڕی خۆی دەردەخاو بێ پەروا هاوار دەکات من حەقم و حەقیش منە .

**وەکوو پێکی خومار شکێن ئەتخۆمەوە بەدوا بینێ**
**هەتا ئەبمە ئاوێنەیەك دنیا هەر تۆم تیا ئەبینێ**
**ئەوساکە تۆ ئەبی بەمن ، منیش وەك تۆ ئالای گوڵم**
**ئەو مەنسورەم تەنها بۆ تۆ ئەخرێتەوە ناخی دڵم**

ئەوەتا حەلاج لەکاتی حاڵی « فناف الله »دا جبەکەی دائەکەنێ و ڕائەکاتە سەر شەقامەکان و خۆی ئەکات بەناو خەڵکداو نهێنیەکانی دەروونی ئاشکرا دەکاو هەرچی لەدڵدایە دەری دەبڕێ و بەرەوڕووی زۆروزۆر داری دەبێتەوە ، شەقێك لەدەفی ڕەق و تەق هەڵدەداو بەدەنگی بەرز هاواردەکات « أنا الحق » من حەقم .

**کەهەستم کرد پایەم هەیە ، بەشم وەرگرت لەعەشقی خۆم**
**تەوژمێکی نوێ لێم ئەدا ، واز ناهێنم لەمەشقی خۆم**
**ڕائەکەم ڕێگەو شەقام ، ئەبم بەوەرزی بەهاری**
**لە هاوارو بەستەو سۆزم ، بۆنی لیقای تۆ ئەباری**

## ڕێگەی سۆفێتی (طریقە)

ڕێگەی سۆفێتی لەم حەوت مەقامەپێك دێ تەوبەکردن ، وەرع کردن لەناشەرعی ، زوهد لەحەلاڵ ، هەژاری ، ئارام ، پەنا بەخوایی (توکل) ، ڕەزامەندی ، ئەمانەیش بەهەوڵی شەخسی وەدەست دەکەون .

**حاڵی سۆفی** : حال مەعنایەکە بەدڵدا دەبوورێ بەبێ ویستن‌و بریتی‌یە لەچاودێری (مراقبة) ، نزیك بوونەوە ، خۆشەویستی ، ترس‌و بیم ، ئومێد وهیوا ، سۆز ، دۆستایەتی ، دڵنیایی ، بینین (مشاهدة) یەقین . ئەمانەش بەخششن لەخواوە .

**زانین ، واتە (معرفة) لە سۆفێتی‌دا** : هەست کردنە بەشت وەك خۆی کە لە واقیعدا هەیە ، چونکە بوونی شت وا لەدەرەوەی بیرو هەستی ئێمەداو چەند پلەیەکیش بۆگەیشتن بەم زانینە دەست نیشان کراوە ، پلەی هەست‌و بیر لێ‌کردنەوەو تێگەیشتن ، ئەی ، زانین (معرفة) لای سۆفێتی چۆنە سۆفێتی هەمان جۆر پلەی داناوە بۆ گەیشتن بەزانین ئەوزانینەی کە دواین مەرجی کەماڵ‌و تەواویەتی‌یە ، وەکوو باسیشمان‌کرد لای سۆفێتی هۆش (عەقل) ڕێگەنی‌یە بۆزانینی نهێنی‌یە خوایی‌یەکان‌و هیچ پایەیەك بۆمەنتیق دانانێن چونکە سۆفێتی پشت بە دێوانەیی‌و بینایی واتە (مشاهدة) و تاقیکردنەوەی دەروونی‌و خەوو ئەندێشەوە دەبەستێ . پلەکانی زانینیشیان ئەمانەن : ـ

1 – **علم الیقین** لەپلەی هەستە ، کە بەهۆی فێرکردن‌و (تعلیم) بینین‌و (مشاهدة) کاری‌گەری دەورووبەرو موتاڵاو گوێ ڕاگرتنەوە دەی گەنێ .

2 – **عین الیقین** ئەمیش بەهۆی ریازەو تێکوشان‌و (مجاهدة) ڕوونبوونەوەی نهێنی‌یەکانەوە دەبێ .

3 – **حق الیقین** ئەمەیان تەنها بەهۆی دەروونەوە ڕێی پێ دەبرێ‌و لێرەوە تجلی‌وفنافی الله پەیدا دەبێ ئەم مەسەلەیە زۆر قووڵە‌و پەیوەندی بەکرۆکی سۆفێتی‌یەوە هەیەو لێدوانی کات‌و توانایەکی تەواوی دەوێ جگە لەخۆهاویشتنە دەریای بێ پەیی فەلسەفەوە .

**کەرەسەی دەربڕین‌و زاراوەی سۆفی‌یەکان**

سۆفی‌یەکان لەدەربڕین‌و ئاخاوتن‌و نووسیندا پەنا دەبەنە بەر نیشان کاری‌و « ڕەمز » هێما ، ئەمەیان لازۆر چاترە لە دەربڕین‌و ئاخاوتنێك کەزەق‌و کت‌و مت‌بێ سەبارەت بەشاردنەوەی حەقیقەتەکانی خۆیان‌و داپۆشینی نهێنی‌یەکان‌و خۆپاراستن لەستەمی ستەمکاران‌و گێرە شێوێنیی شەرع بازەکان : سوهرە وەردی ئەڵێ : ـ

| | |
|---|---|
| **بالسر ان باحوا تباح دماؤهم** | **وكذا دماء العاشقين تباح** |
| **حـافاهم فصفـوا ، قلوبهم** | **في نورها المشكاة والمصباح** |

ئەگەر نهێنی‌یەکان دەربڕن ، خوێنیان حەلاڵ دەکرێ هەربەو چەشنەی کە خوێنی عاشقەکان حەلاڵ دەکرێ ، خوای مەزن لەگەڵیاندا کۆکەو ئەمانیش پاك بوونەتەوەو دەروونیشیان لەڕووناکیدا دەڵێی چراخانە .

لای سۆفی‌یەکان چونکە مەعنا شتی سەرەکی‌یەو بەهۆی زەوقی تایبەتی‌یەوە دەردەبڕرێ ئیتر هێمایەك یانیشان کاری‌یەك لەدیوانێك‌و لەکتێبێك بەکەڵك‌ترو داڕێژراو ترو جێگیرترە . ناوەرۆك‌و ڕوخساری پێکەوە گونجاو ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کەناوەرۆك گەوهەرەو ڕوخسار تەنگ دانی ئەو توخمانەیە کە ئەو ناوەرۆکەی لێ پەیدا دەبێ . بۆیەکان سۆفی‌یەکان کەرەسەی تایبەتی خۆیان هەیە بۆ خرکردنەوەی توخمەکانی ناوەرۆکی دەربڕین‌و شیعرو پەخشان‌و گۆرانی‌ی‌و وتوووێژی ناوخۆیان‌و زکرو تەهلیلەو نزاو سۆزو کەیل بوون . جالەبەر ئەوەی سۆفێتی ئیسلامی سەرباس‌و ناو باسی ئێمەیە ، سۆفی‌یە گەورەکان پاشماوەی دەست نووس‌و چاپکراویان زۆربەی زۆری عەرەبی‌یەو ئەگەر عەرەبیش نەبێ زاراوەکان‌و کەرەسەی تایبەتی باس‌و خواسەکانیان هەر عەرەبی‌یە بەعەرەبی ماوەتەوە منیش ناچارم هەمان ڕێگە بگرم‌و ئەو زاراوەو کەرەسانە وەك خۆی ڕیزکەم .

الحقيقة المحبة العشق القرب البعد الأنس السكر الهمة التوحيد الورع الفناء البقاء المريد الراد السالك السفر المسافر الطريق الحال المكان القبض البسط الهيبة التواجد الوجد الجلال الجمع الغيبة الغربة الحضور الحضرة الصحو الذوق الشرب المحو الأثبات النفي النفس القلب الحبيب الهداية العاصي الأغراق التأمل المجاهدة المجاهرة المكاشفة التجلي الزهد الخمرة المرامة ....... هەتد لەکوردیدا ، پیر ، پیری ، موغان ، مەی ، یار ، دەست‌گیر ، گۆشە ، گۆشەگیری ، کەمەڵکێش ... هەتد .

**سێکس و مەی لای سۆفییەکان** سۆفییەکان مرۆڤن ، هەموو پێناس و ڕەوشتێکی ئادەمیزادییان تێدایە ، تەنها شتێك ئەوان جوێ دەکاتەوە لەخەڵکی ئاسایی ، ئەوەیە ئەمان لەهەوڵ و تێکۆشاندان بۆ ئەوەی خۆیان لەچێژە خۆشەکانی دنیا داری دوور بخەنەوەو خۆیان تەرخان بکەن بۆ گەیشتن بەئامانجی پیرۆزیان کەتوانەوەیە لەزاتی خۆشەویستیدا بەڕێگەی عەشقی پاك و چاکدا . لەگەڵ ئەمەیشدا کە دەوری کەلەپووری ئەو سۆفییە مەزنانە دەکەینەوە چ شیعر ، چ پەخشان ، چ سۆزو ئەندێشەیان ، هەندێ دیاردە دەبینین کە جێی سەرسوڕمانە . ئەگەر وەك ڕووداوێکی ڕووت بۆی بچین ، بەڵام ئایا وابوون ؟! ئەم پرسیارە هەتا ئێستاش چاوەڕێی وەڵامێکی چەسپاوە سادە پەرستی یاخود جوان پەرستی ، یەکێکە لەو دیاردانە . ڕووی جوانی کوڕی شۆخ و خەت نەداو هۆبەخشی چێژی دەروونی و هەستی سۆفییەکانە لێرەوە ڕاگرتنی کوڕی سادە ڕوو ، دۆست و دۆستکاری ئافرەتی جوان بەلایەکە لەوبەلایانەی دەستی لەدامێنی سۆفییەکانە وەئاڵاوە ، یوسفی کوڕی حسین کە یەکێکە لەو سۆفییە مەزنانە ، دەربارەی خۆی دەڵێ ، هەرچی دەبینین کە دەیکەم ئێوەش بێ یەك و دوو بیکەن جگە لەڕاگرتنی کوڕانی سادەڕوو ، بەیار ، چونکە ئەمە لەهەموو فیتنەکان فیتنە ئەنگێزترە ، چەند جار پەیمانم بەخوای خۆم داوە کەهاوڕێیی کوڕانی سادەروو نەکەم ، بەڵام جوانی ڕووی ئەوان و بەژنی بەرزو چاوی بەنازیان پەیمانی پێ شکاندووم ، ئەوەتا (نالی) ئێمە ئەڵێ .

**بۆ سەیری خەرامیدەنی ئەم سەرو قەدانە**
**سۆفی لەتەڵەبدان و هەموو سالیکی ڕاهن**

سەبارەت بەمەی کەورد دەبینەوە لەمەسەلەکە ، دەبینین هەندێك لەو سۆفییانە کە دێنە سەرباسی مەی و کاری مەی و تامی مەی ، وامان لێدێ کەبڵێین ئەمانە بەڕاستی مەی نۆش بوون و لەکووپەی مەی دا کولاون ، ئەینا ئەم بۆچوونەیان سەبارەت بەمەی بۆچوونی کەسێك نییە خۆی لەتاقیکردنەوەکەدا سوور نەکرابێتەوەو مەیش لەناخی ئەوانە گیرابێتەوە .

**ئەن تەڵخی خۆش کەسۆفی أم الخبائث‌ش خاند**
**احلى لنا واشهیٰ من قبلة العذارىٰ**

**- حافظي شیرازی -**

ئەوتاڵە خۆشەی کەسۆفی پێی ئەڵێ خراپە لای ئێمە شیرین ترو بەچێژترە لەماچی کیژۆڵە کان .

**بۆ تعبد ، گەر خوا خەلقی ئەکرد جیسمی بەشەر**
**وەك ملائك ساکنی ئەفلاك ئەبوون و ئەمربەر**
**دیارە سەوقی بۆیە کردوونە خەراباتی وجوود**
**تێبکۆشن ، مەی بنۆشن تاکو ئەمرن بێ خەتەر**

**- حەمدی -**

| | |
|---|---|
| لو كان لي مسعدٌ بالرّاح يسعدني | لما انتظرت لشرب الراح إفطارا |
| الراح شئٌ شريف انت شاربه | فاشرب ولوحمّلتك الرّاح اوزارا |
| يامن يلوم على الصهباء صافية | خذ الجنان ودعني اسكن النارا |

ئەم شاعیرە سۆفییەش وامان تێدەگەیەنێ هیچ شتێك نییە ئەو خۆشییەی پێببەخشێ کەمەی پێی دەبەخشێ ، داوای ئەوە دەکات کەبخورێتەوە ئەگەرچی ببێ بەهۆی ئەوەی کەباری گرانیش بخاتە سەرشانی مەی نۆشەکان و ئەشڵێ ئەی ئەوکەسەی کە لۆمەم ئەکەی لەسەر خواردنەوە ، برۆ بەهەشت بۆتۆ ، واز لەمن بێنە بابچمە ناو ئاگر .

| | |
|---|---|
| إذا العشرون من شعبان ولّت | فواصل شرب ليلك بالنهار |
| ولا تشرب بأقداح صغار | فقد ضاق الزمان عن الصغار |

کە بیستی شەعبان تێپەڕی ئیتر تۆخواردنەوەی شەوت بگەیەنە بەڕۆژ ، و بەپێکی بچووك بچووك مەخۆرەوە ، چونکە دنیا بەشتی بچووك ئاخنراوە؟

مەحوی ئەڵێ :

له مەیخانە ، خودا گەر ئێمە دەرچین
بەکێ بەین ئیلتیجا ، بۆکێیە دەرچین
کە ئێمە چوونە جەننەتمان بەتۆدا
لە ئێمە لادە زاهید ، ئێمە هەرچین

ئێمە لەبەشێك لەم باسەدا وتمان نیشان کاری و هێما کەرەسەی دەربڕین بوون لای سۆفییەکان و سۆفێتی خۆشی دنیای هێماو ئەندێشەو چوونەوە ناخە ، لەبەر ئەمە دوور نییە ئەگەر هەمووشیان بەم نیازانە دەستیان بۆمەی و کوڕی سادەو ئافرەتی شۆخ درێژ نەکردبێ لەشیعرو پەخشان و وتاریاندا هەندێکیان هەر بەم مەبەستە بووە ، لەشانازی کردندا بەخۆیەوە شێخ عبدالقادری گەیلانی دەڵێ :

| | |
|---|---|
| شربتم فضلتي من بعد سكرى | ولا نلتم علّوي و إتصالى |
| ولو ألقيت سرى فوق ميت | لقام بقدرة البارى تعالى |

دانەوێڵەی کەم‌بوو ، ئاوی گەرم تاڵ‌و سوێر بوو . لوتکەچیاو دارو دەوەنی نەبوو . سەحرایەکی بێ‌سێبەربوو . کەوەکـان لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆیان لەبەر هەتاو ڕایان دەبوارد .

چەندی کەوەکان دانیان بەخۆدا گرت نەیان تـوانی لە نۆ ڕۆژ زیاتر بمێنێنەوە . ڕۆژی دەیەم حەجمانیان لێ‌هەڵگیرا . ئارامی یان نەما ، ناچار گەڕانەوە تا گەیشتنە سەر تخووبی ئـاقاری کێوی هەڵگورد ، گوتیان :ـ

ـ ئـەگەر ئێمـە بچینەوە نێـو ڕەوەکەمـان ، بەزۆریش بێت نۆبەتمان پێ دەگرن .

دوڕە ڕووی تێ‌کردن‌و گوتی :ـ

ـ من تەگبیرێکم کردووە .

ـ دەبڵێ بزانین چی‌یە ؟

ـ وای بەچاك دەزانم هەرچوارمان خۆمان باوێینە ماڵی هاش‌و هووش ئەو بەس نەمانخوات‌و لەپـاڵ خۆی بمـان حەوێنێتـەوە بەسمانە ، ئەوکاتە لە ڕەوەکەمان بێ‌منەت دەبین .

هەرسێکیان گوتیان :ـ

ـ تەگبیرێکی زۆر باشە .

هەرچواریان بەدزی بەبێ ئەوەی ڕەوەکەیان هەستیان پێ بکەن خۆیان گەیاندە ماڵی هاش‌و هووش .

هاش‌و هووش کە چاوی پێ‌کەوتن ، لەمێژیش بوو گۆشت کەوی نەخواردبوو لەخەنی خۆشیان زۆر نەمابوو باڵ بگرێت .

دوڕە گوتی :ـ

ـ کەورەم ئێمە لە خزمەکانی خۆمان دابراوین ، ویستیان ئێمە شەو ببینە حەسحەس بـەدیار تـۆوە ، ئێمەش ڕازی نـەبووین ناکۆکیمان کەوتە نێوان ، بۆیە وا هەرچوارمان پەنامان هێناوەتە بەر جەنـابت . تۆ بـەس مەمـان خۆ ، لەپـاڵ خۆشت بمـانت حەوێنەوە ! ئـەوکاتـە ئێمە تـاکو مـاوین بەنـدەو مل کـەچی جەنابتین .

هاش‌و هووش گوتی :ـ

ـ مادام ئێوە هاتوونە ماڵی من هیچم لەدڵ نەما ، تازە هەتا هەتایە بووینە برا «خێرمان خێر ، شەڕمان شەڕ» .

کەوەکان گوتیان :ـ

ـ زۆر زۆر سوپاسی شـا هاش‌و هـووشمان دەکـەین ، هەر فرمانێکت هەیە بەدڵ‌و گیان لەخزمەت ڕاوەستاوین .

ـ من هیچ ئیشم پێتان نیە تەنیا شتێك هەیە .

ـ فەرمووبڵێ بزانین چی‌یە .

ـ ئەو کەوانەی کەشەو بەدیـارمەوە دەبنـە حەسحـەس ، بـەراستی زۆریان پـەست کردووم . هـەر لە ئێـواری هـەتـا ڕۆژهەلات سەرەتاتکێم لەگەڵ دەکەن . بۆ هەر لایەك بچم لێم دەکەنە هەرا ، کەوی ئـەو ناوچـەیەم لێ بـەئاگـا دێنن . لەو شەوەوە کە ڕەوەکەتان فێری نۆبەت گرتن بوونە ، من کەوێکم پێ نەگیراوە .

جا من ئەوەندەم دەوێت «هەموو شەوێ ئێوە هەرچـوارتان لە دەورو بەری ماڵی من خۆتان لەنێـو نارچـەدا مەلاس بـدەن . ئەکێك لەم حەسحەسانەم بۆ بگرن» . تاکو بیخۆم ، ڕقی خۆمی پێ دابمرکێنم ئیتر من چیدیکەم لێتان ناوێت .

کەوەکان گوتیان :ـ

ـ سەرچاوان ئەوە هەر زۆر ئاسانە .

هاش‌و هووش زۆر هەوەستی پێ‌هات‌و گوتی :ـ

بەڕاستی بۆم دەرکەوت کە ئێوە دڵسۆزترین هاوڕێن ، بـەلام دەبێ ئێوە ئەم ڕەنگـەی خۆتـان بگۆڕن . تـاکو لەگـەڵ کەوە دوژمنەکان جیاوازیتان ببێت .

دوڕە گوتی :ـ

ـ قسەی شاهم زۆر زۆر ڕاستە . ڕووی لەسێ کەوەکەی‌تر کردو گوتی :ـ

ـ پێم ناڵێن :ـ «ئێمە ئەم ڕەنگە ناشیرینەی خۆمـان لەکوێ پەیدا کردووە .»

قەرپە لێی وەرگرتەوەو گوتی :ـ

ـ خوا ئەگەر بەختی بـدابایـە ئێمە ئـەم ڕەنگە بـۆرەی بۆ دروست نەدەکردین .

دوڕە گوتی :ـ

ـ بەراستی بۆ ئێمە سەربەرزی‌یە کە جەنابی هاش‌و هووش ئەم ڕەنگە ڕەشە جوانە بریقـەدارەی خۆی بـە ئێمە خـەلات بکات .

هاش‌و هووش گوتی :ـ

ـ دەمت تێك‌بنێ ئەم قسەیە لەسەری خۆت‌و باوکت زیادبوو . واپێت دەڵێم :ـ «جارێکی‌تر نـاماقـووڵی وا نەکـەیت . داوای ڕەنگی من بکەیت» .

دوڕە بە لەرزینەوە گوتی :ـ

بە .. لێ ... بە ... لێ ... قور ... بان .

قەلپە ڕووی لە دوڕە کردو گوتی :ـ

ـ  شامان ڕاست دەکات ، خوا هەروەهای داناوە :ـ

«ڕەنگی شاو گەدا هەرگیز نابێ یەکسان بن»

ئەوکاتە هاش و هووش دوو قالبە چویتی لەنێو گۆمیلکە ئاوێـک تواندەوە ، فرمانی بەکەوەکاندا کە خۆیان تێ وەربدەن .

ئەوانیش هەرچوار خۆیان تێ وەردا . هەموو لەشیان شین شین هەلگەڕا .

قەلپە گوتی :ـ

ـ  بەخوا بابە ڕەنگێکی جوانە .

هەرچواریان لەخۆشیان دەستیان بە پێکەنین کرد .

## بەشی پێنجەم

هەموو شەوێ کەوە شینەکان لەنێو نۆرینگدا خۆیان مات دەکرد هەرکە یەکێـک لەکەوە نـۆبەتـدارەکان لێـیان نزیـک دەبووەوە ، لە هیکەوە پڕیان دەدایەو دەیان گرت . دەرخواردی هاش و هووشیان دەدا .

بەم جۆرە هاش و هووش هەموو شەوێ کەوێکی هەبوو ، کـە هێلانەیەکیشی دەدیتەوە یەکێ لە کەوە شینـەکانی ڕەوانـەی ژوورەوە دەکرد . هێلانەکە چی تێدا بوایە ، ئەم کەوە بۆ هاش و هووشی فڕێ دەدایە دەرەوە . ئەویش دەی خوارد .

هاش و هووش بە هۆی ئەم کەوە شینـانە پـارووی کەوتبـووە ڕۆنێ . کەوەکان دیسان وەکو جاری گۆڕین بـەدەست هاش و هووش کەوتنە شپرزەیی ، هەرچەندی سەریان دەهێناو دەبرد هیچ ڕێگایەکیان شك نەدەبرد ، کە ئەمجارە خۆیان پێ دەرباز بکەن . دەیان گوت :ـ

ـ  ئەمجارە قەت ڕزگارمان مابێت .

بەلام مەزدە هەردەم دلی دەدانەوەو دەی گوت :ـ

ـ  تکاتان لێدەکەم ووره بەرمـەدەن . برواتـان هەبێت کـە ڕۆژێـك دادێت تۆلەی خـۆمان بـە ئاسـانی دەکەینـەوە . بە یەکجاریش ڕزگاریمان دەبێت .

کەوەکان لێکرا ئاخی .. یان هەلدەکێشاو دەیان گوت :ـ

ـ  کوا ؟ بۆ ئەوێ ڕۆژێ ... !

کەوە شینەکان هیچکات نەیان دەوێرا دووبست لە هاش و هووش دوور بکەونەوە ، ئەگەر یەکێکیان لە پەنایەکدا لە ڕەوەکەیان بەدەر بکەوتایە هەشت نۆیەك تاویان دەدایەو دەیان گوت :ـ

دونـیـا جـێی پـێـکـەنـیـنـە
کـەوە دنـدووکـی شـیـنـە

لە ئـێـلی خـۆی دابـڕاوە
زۆڵی نـاو لەخـۆ نـاوە

زۆڵی بـەدخـوو ، بـێ ئـابـڕوو
لاچـۆ لەپـێش چـاومـان زوو

ئـێـمـەی کـەو زۆلمـان نـاوێ
بـا نـەمـان خـاتـە داوێ

ئەویش ئەوکات بە پڕەپڕ خـۆی دەکوتـاوە پاڵ هـاش و هووش .

بەم جۆرە هاش و هووش خواردنی لەمشەبوو ، تاکو دوا وەرزی پایز داهات . دونیا ساردبوو ، بەفرێکی زۆر لە هەلگورد باری .

هـاش و هـووش نـەی تـوانی خـۆی لەدەرەوە ڕابگـرێت ، بەیەکجاری چووە ژوورەوە . لەبەر تەنگی ژوورەکـە دوڕە بە ئاستەم پێی کەوتە سەر کلکی هاش و هووش .

هاش و هووش زۆر تووڕەبوو گوتی :ـ

ـ  هەی بێ ئەمەك چما وەهات لێهات کە پێ لەمن بنێیت ؟

دوڕە بە لەرزینەوە گوتی :ـ

ـ  ئێ .. خۆ .. چ ... کف .. رم .. نە .. کرد .

هاش و هووش بەم وەلامە هێندەی تر پەست بوو گوتی :ـ

ـ  لەسەر ئەم حالەش زمانی چەند ڕەپە ، ئەمەی گوت و پڕی دایەو گرتی .

هەرچەندی دوڕە هاواری کردو گوتی :ـ

ـ  «گەورەم تکات لێدەکەم ئەمجارە جەبم بدە»

گوێی نەدایەو لرفی کرد .

سێ کەوەکەی تر یەکسەر کڕنووشیان بۆ بردو گوتیان :ـ

ـ  دەست خۆش ئەمە ئەنجامی ئەو کـەسەیـە کە لەعـاست گەورەی خۆی بێ ئەدەبی بکات . ئێمە سوڕ دەمان زانی ئەم بەدخووە لەبەر هەلەپاسی و نالەبـاری ئاوا خـۆی بە سـۆدرە دەبات .

## بەشی شەشەم

کەوە حەسحەسەکان بویان دەرکەوت :ـ هاش و هووش

لەگەڵ کەوە شینەکان دوو سێ ڕۆژە لە ژوورەوە نایەنە دەرەوە چوون خەبەری مەزدەیان دا .
مەزدەش کەوەکانی کردەوە گوتی :-
- خزمینە من وای تێدەگەم :- هاش و هووش بەهۆی بەفر کەوتن نە توانای هاتنە دەرەوەی ماوە ، نە پێویستی بە خواردن ماوە .
+ ئێمە ئێستا لە دەستمان دێت ئەو کەوە نالەبارانەی خزممان بکوژین کە ئەوانمان لەناو بردن ، دەتوانین وەکو جاران خۆمان لە هاش و هووش بپارێزین .
کەوەکان گوتیان :-
- چۆن ؟
- کەوە شینەکان وەك هاش و هووش نین . پێویستی یان بە خواردن دەبێت . ناچارن بۆ لەوەڕ بێنە دەرەوە ، بەلام ئێمە کاتی هاتنە دەرەوەیان نازانین . پێرویستە ئەمشۆکە هەموومان بچین لەنزیك کونەکەی هاش و هووش دا خۆمان مات بکەین . کە هاتنە دەرەوە بۆ لەوەڕ بیان گرین .
کەوەکان گوتیان :-
- زۆر باشە .
کەشەو داهات کەوەکان ئامۆژگاری یەکەی مەزدەیان بەجێ هێنا ، بۆ سبەینێ لەدوای هەتاو کەوتن کەوە شینەکان هەرسێکیان هاتنە دەرەوە ، کەوەکانی دیکە پێنج شەشێکیان لای کونێیان لێ گرتن . هەندێکیش کەوتنە دوویان . ها لێرە ، ها لەوێ ، زۆری پێ نەچوو هەرسێکیان لە خۆڵی وەردان . زیوار بە زیواریان کردن . ئەو کاتە مەزدە گوتی :-
- وا پێدەچێت هاش و هووش ئێستاکە لەبەر ساردی سربوو بێت ، ئاگای لەخۆ نەمابێت ، ئەگینا بە هاواری ئەم دەست و پێوەندانەی خۆی هەر دەهات .
+ من بۆ تاقی کردنەوە وا دەچمە ژوورەوە ، ئەمەی گوت و چووە ژوورەوە کە گەیشتە کلکی بەترسەوە دندووکێکی بە ئاستەم خێواندە سەری کلکی . هاش و هووش هەستی نەبوو . یەك دوو دندووکی تریشی لێدا هەر جوولەی نەبوو .
ئیتر هەروەها تا گەیشتە عاست سەری ، ئەوکاتە بۆی دەرکەوت کە هیچ ئاگای لەخۆ نی یە چووە سەر تەپلی سەری تا بە دندووکان هەردوو چاوی ڕژاند .
ئەوجا هەیهای لێکرد بۆ دەرەوە . مژدەی دایە هاورێ کانی .

کەوەکان کە ئەمەیان بیست لێکرا هورووژمی یان کردە ژوورەوە بەراکێش هێنایانە دەرەوە ، دایانە بەر دندووکان تاکو مێشکیان پرژاندو فەراقیان لەبەر بری .
جا لەخۆشیان هەڵپەرکێیان دامەزراندو ئەمەیان لەگەڵ دەگوت :-

ئێمە کەوی کوێستانین
پەروەردەی ناو شاخانین

چەندی بڵێی ڕوو خۆشین
بۆ شادی بە پەرۆشین

درین خاوەن وجاخین
لە زوڵمو زۆرا یاخین

کە لە ئاست دوژمن چەقین
نەبزێوو کەللە ڕەقین

دروشمی مانو نەمان
بۆتە پەیڕەوی ژینمان

دوژمن با ئەژدیها بێ
وەك ئەمە نەقولا بێ

بچێتە ئەو ئاسمانە
لەچنگمان ڕزگار نابێ

**«کۆتایی هات»**

1981/2/17 — 16

**فەرهەنگۆك :-**

جەب = لێخۆشبوون
چویت = ڕەنگێکی شینە ، کاتی خۆی جامانی پێشین دەکرا .
خوبزە = خزمەتکار
نارچە = نۆرینگە = مەکۆ = سیپێر

زیاد محەمەد ئەمین
قەڵادزێ ـ 1980

# گەشتێك بەنێو گوڵزاری مەقامی «ئازیزە»دا

بریسکە بریسك و پرشنگ دانەوێ دڵۆپە ئاونگی سبەینەی نیسانێ ، لەسەر پەلکی گوڵ و دارو دەوەنـان ، ئەوەنـدە تیژ بوون چاوی دەچاو قایمـانیان شـۆڕ دەکردن ، وەك ئـەوەی دەچوو کە هـەموو بستێکی چیـای چواسی[1] بێچـووە ڕۆژێکی لێ هەڵهاتبێ .

بـالدار ئەوەنـدە سەرگـەرمی گۆرانی گـوتنێ بـوون ، دەتگوت لە هەموو سەر تەپۆلکان زەماوەندێك دەگەڕێ . لەنێو ئەودیمەنە بەهەشتی یەیدا بوو ، کەکاکی شوانیش خۆشترین ئاوازو ناسکترین ووشەی هەڵبژاردو تێکەڵاوی ناو ئەو هەموو ئاوازە جۆراو جۆرانەی کردو ، دەنگو دەنگدانەوەی زەنگوڵەی ملی نێرییە ڕەشی گۆردو زەردیشی[2] لێ ببوو بە ، بەسۆزتـرین ئاوازی مۆسیقاو تەلی هەست و ئارەزووی دەجووڵاند .

(... ئەمن بۆت هەڵدەڵێمەوە بەناسکە بێریان ، ئەگـەر چاویان ڕەشن و برۆیان بەکوڵاوە ، لەوان بێریان یـەکێکیان لێ بەجێ دەماوە ، گۆمیلکە گۆمیلکەی ئـارەقێی لەنێو سینـگەو مەمکان ڕاوەستاوە . کیژ دەڵێ : ئەگەر گولەکەی مێردان لێی بخواتەوە بۆی دەبێتەوە بەسندان و ژەهرەمارە ، ئەگەر هەتیوە لاوەکـەی من لێی بخـواتـەوە لەبـۆی دەبێتـەوە قـەنـداوو شەکراوە) .

لەوێ ڕۆژێوە بڕیارمدا کەبەدوای مـەقامی ئـازیزەیـدا بگـەڕێم و هەرنـەبێ هێنـدێـك لەکـۆپلەکـانی کـۆبکـەمـەوەو ئەمگەوهەرە پرشنگدارە بێ وێنەیە کەلەپـوورەی باپیـرانمان لەجەنگەڵی بزربوونیدا ڕزگار بکـەم و بیهێنمە سـەر ڕووپەڕی کاغەزان و بەردەستی خوێندەواران .

ئازیزە گوڵزارێکی پان و بەرین و پڕ گـوڵی هەمـە ڕەنگ و جـۆراو جۆرە ، هـەر گۆرانی بێـژێکیش بەئـارەزووی خـۆی گوڵبژێری تێدا کردووەو بەئاوازی بەیاتی (ئازیزە)ی غەمی دڵی خۆی پێ پەراگەندە کردوون . خدربلوێر لەهەندەرانرا وەستاو شاگردان دێنێ بۆ دروونێ کەوای ڕەشـەڕیحانـەی پەراوێـز سوورەگوڵی ئازیزە گـوڵێ ، حەمـە کوێـر بەئـاین و جوانی یـە سروشتی هەڵدەڵێ ، بـرایمی حەمـە عەزیـزی لەنێو سینـگەو مەمکان باقە بەستێ گوڵان دەکات و سەلیمی بایزیش لەدەست ستەمی ئادەمیزادی هاوار دەکات ، ... ....

## ـ ئازیزە ـ

ئای ... ئای ... ئازیزێ ، ئازیزە گوڵێ ،
ئەمن کەوایەکی لەبۆ ئازیزەکەی خۆم دەکەم **لەپەلکی ڕەشـە** ڕیحانێ ، پەراوێزانی تێدەکەم لەپەلکی **دەسوورە گوڵێ ،**
وەستایەکی بۆ دێنم لەدیاربەکرێ ، **شاگردانی بۆدێنم لە قوچە** موسڵێ ،
کەوایەکە لەبۆ ئازیزەکەی من بدرووێ ، **لەگەڵ هەموو تەقەڵ و** تەریبانی ئازیزێکی خۆش **بێ‌هەڵبڵێ .**
ئازیزێ ، ئازیزە گوڵێ ، دەوەرە ، **ماڵێ من و ماڵێ بابی من ئازیز**

ئازیز ، ئەمن پیر نەبووم ، پیرت دەکردم،
دەردە دار نەبووم دەردەدارت دەکردم ،
ڕەنگ زەردو لێو بەبار نەبووم ، ڕەنگ زەردو لێو بەبارت دەکردم ،
دەتکردم بەتۆزو بەبەر بارانێت وەر دەکردم ،
بارانە وەخۆیان هەڵنەدەگرتم ،
کزەبایەکی شەماڵی دەهات و ، لێی دەدام و بەبارانەوە بە جۆگەو جۆگەلەو ڕووبارانی وەردەکردم ،
بەبەر ئەوان هەوارو ، چیغو ، ڕەشماڵو ، کەپرانیدا ڕادەبردم ، هەموو ئێوارەو سبەینان ، کیژی ئەوان گەورەماڵو نەجیبو ، خانەدانانم دەهاتنە سەرێ ، سەروچاوی خۆیان پێ دەشردم ،
سینگو مەمکی خۆیان پێ تەڕ دەکردم .
ئازیز ، دەوەرە ماڵێ منو ماڵێ بابی من ئازیزە گوڵێ .

کیژ دەڵێ : ئەوە سەرێکی من دەیێشی ، دڵەکەی منی ماڵ وێران بەوەیە(٣) .
هەر بەکابەی شەریف کەم ، بە خالقێ گەورەیە ،
لەشکرێك لە من دیارە ، لەشکرێکی گەورەیە ، گەورەو حوندەیە(٤) .
ئەو لەشکرە کێیە ؟ کێ نییە ؟ ! پێنجسەدی فەلەیە ، فەلە ڕەشکەیە ،
پێنجسەدی تورکە ، تورکمانە ، پێنجسەدی نیزامی خاسسەیە .
پێیانە تۆپە ، تۆپخانەیە ، تیرێ سەر بەپەیکانە ، تفەنگێ ماتییە(٥) کارخانەیە .
دەداتەوە بەسەر زینوێ شێخی باڵەکاندا ، تالان دەکا عێلێ ، عوربانێ ، بادەداتەوە بۆ سەر ماڵێ حاجی برایماغای بەحیلەیە .
کیژ گاز دەکا دەڵێ : هەتیوەلاوە ، ئەتۆ لەخەمێ تالانو ماڵێ مەبە ! وەرە ، بائەمنو تۆ لێك بهاڵێین ، سێ شەوان بە شەوی پاییزێ ، دوو ڕۆژان بەڕۆژی بوهارێ ، وەك توولی نەمامێ ، وەك خەڵفی چنارێ ، وەك قەدی لاولاوی ، لەبۆمنو تۆ کەڵێك خۆشترە لەخەراجاتەکەی ئەوی عێلو عوربانەیە . ئازیزێ ، دەوەرە ، ئازیزە گوڵێ .

سەرێ من دەیێشی ، کوڕە بابەکەی بابم ، دڵی منی ماڵ وێران بەژانە ژانە .
ئەوە گرمە گرمێك دێ لەوان سەرانە ،
هێندێك دەڵێن بایەو هێندێك دەڵێن بارانە .
هێندێك دەڵێن بوولەرزەیەو ، هێندێك دەڵێن تەرزەیەو ، هێندێك دەڵێن بای سەرسەرێیەو ، هێندێك دەڵێن مەنسووری هەللاجەو ، هێندێك دەڵێن قارەمانی دێوقرانە .
ئەوە کیژ دەڵێ : نەتەرزەیە ، نەبوولەرزەیە ، نەبای سەرسەرێیەو ، نەمەنسووری هەللاجەو ، نەقارەمانی دێوقرانە !
ئەوە کوڕە لاوەکەی منە ، دێتەوە لەسەفەرێکی گەورەو گرانە ! .
چەکی(٦) دەمنی لەکنن بەنیشانە ،
لە ڕێبازێ بۆ فێنکییە دڵی خۆی تێکی هەڵدەدانە(٧) ،
هەر لێرە لەسەر سنگی منی بابان وێرانە ،
جووتە مەمکۆڵان دەیان کردەوە شەڕە قۆچو تێك هەڵدانە .
ئەمن دەڵێم : کوڕە ، هەتیوەلاوە ، ئەتۆ وەرە ، سمێڵێ خۆیان لەسەردادەو لێ یان بکەوە بەنێوانە ،
ئەوەکو دنیا ببێتەوە وێرانە .
دەوەرە ، ئازیزێ ، ئازیزە گوڵێ .

ئەمن بۆت هەڵدەڵێم ، بەکوێستانی سێوە سوورو گەنمان ،
بەکۆزی دەبەرخان ، بەکۆسرەتی شاڵە بەگیان ،
بەسپی سەنگی موکریان ، بەقەندیلە کچەکەی مامە کۆیییان .
دەوەرە ، ئازیزێ ، ئازیزە گوڵێ .
ئەمن بۆت هەڵدەڵێم : بە ڕنوو ڕنووی بەفرێیە ،
بەکورکوڕی مەرگێیە(٨) .
ئەگەر نێری سێزدە ساڵو چواردە ساڵی لێ دەگرنەوە پیرە پیرێو لێی دەکەنەوە بنارێیە .
بەهارانی لێ وەسەر دەکەوتن مەڕدارو ، لەکوێستانو بڵندی زەنوێری دەبوونەوە نیشتەجێیە .
پاییزان ئەگەر دەهاتنە خوارێ ، بێریان دەیانگرتەوە گەڕی دیلانێ ، ئارەقیان دەکەوتەوە سەرکوڵانو ، لێیان شل دەبوونەوە پانیەو پێیە .
دەوەرە ، ئازیزێ ، ئازیزە گوڵێ .

ئەمن بۆت هەڵدەڵێم بەئەشکەوتی کەڕواوە[9] ،
ئەگەر سەرە بەهاران ئەوان سەفرەیی و گەڵاڵەیی یان لێیان هەڵدەداوە .

ئەمن بۆت هەڵدەڵێم بەکانیکەنیرێ[10] ئەگەر مێشێ بەدۆ[11] خۆی لێنەداوە .

ئەمن بۆت هەڵدەڵێم ، بەقەندیلی بڵندوبەرین ، هەتا بەفری نوێ دەباری بەفرێ کۆنی لێماوە .

بۆت هەڵدەڵێمەوە ، بەناسکەبێریان ئەگەر چاویان ڕەشن ، برۆیان بەکولاوە .

لەوان بێریان یەکێکیان لێ بەجێ دەماوە ،
گۆمیلکە گۆمیلکەی ئارەقێی لەنێو سینگو مەمکان ڕاوەستاوە .

کیژ دەڵێ : ئەگەر گولەکەی مێردان لێی بخواتەوە بۆی دەبێتەوە بەسندان و ژەهرەمارە ، ئەگەر هەتیوە لاوەکەی من لێی بخواتەوە ، لەبۆی دەبێتەوە قەنداوو شەکراوە .

ئازیزێ ، دەوەرە ، ئازیزە گوڵێ .

دەوەرە ، وەرە ، ئازیزێ ، ئازیزە گوڵێ .

ئەمن بۆت هەڵدەڵێم ، بەوێ ماڵێ ، بەوێ مزڵێ .

لەبۆت هەڵدەڵێم ، بەوێ کەپرێ ، هەر بەوێ کەپرە گوڵێ .

ئەمن لەبۆت هەڵدەڵێم ، بەئیمامی عەلی ، ئەگەر سوار دەبوو لە دوڵدوڵێ ،
هەرلەبەر پێنجسەد پاڵەوانی کورسی نشینی کافران ناخەجڵێ .

ئازیزێ ، ئازیزەگوڵێ .

ئەوە سەدایەکم دەگەیشتێ برادەرینە ،
سەرێ من دەیشی دڵێ من بە برینە برینە .

ئەمن دەچوومەوە سەر گۆڵێ کابەکرێو[12] لەوێم پۆلێك سی هەڵدەفڕاندینە .

هێندێکیان سۆنەن ، سەرکەشکەن ، سپین ، هێندێکیان مراوینە .

وەدوویان دەکەوتم بۆ کوێستانی باژاڕو ، جەماڵ دین و ، کێلێو ، زەردەلالان[13] هەتا لە ترکەش و کەوپەڕان[14] دەنیشتنەوە لەمێرگی دەشین شینە .

ئەگەر لەوێشم پاریز بۆدەبردن دەفڕینەوە ، دەچوون لە گۆل گۆلی خوێیە دەنیشتینە .

ئەگەر یارێ من ناناسن ! بەلەکی ووڕەی هەلاجین ، پانیەی قەیسی ئالوێنینە ،
لێوی ئەتلەسن ، ددانی مروارینە ،
هەموو ساردە سبیانان دێتەوە لەڕێیە سەراوێ ، بەکراسێکی پەشمین پەشمینە .

ئازیزێ ، ئازیزەگوڵێ .

ئازیز ، ئەمن بۆت هەڵدەڵێم ، بەکوێستانی برایم جەلالی[15] .

ئەگەر شوانکارە سەرەبەهاران لێی وەسەردەکەوتن بۆ سەربەنی کوێستانێ ، هەریەکی بەسێچوار هەزار سەرمەڕومالی .

بۆت هەڵدەڵێم ، بەحاجی موحەممەدی ئەستەمبوولێ ، ئەگەر بەهاران بەسەر دەکەوێتەوە بۆسپی ڕێزی غەیلانیان[16] ، دەبێتەوە گەورەی پێنجسەدو بیست و دوو چادرو ڕەشمالی .

ئەمن بۆت هەڵدەڵێم ، بەحەمەدی شێرە قولێ ، ئەگەر لەبەر شۆخ و شەنگیانی بەلکەی چەفتەی تویێیەکی عەردی ڕادەمالی .

ئازیزێ ، ئازیزەگولی ، دەوەرە ماڵێمن و مالی بابی من ....

ئازیزێ ، بەژنێ باریکت بەمن بمێنێ بەدارەکەی عودێ ، ئەگەر دەڕزکا[17] لەدەرکێ حەماغای کۆیە ، کوڕە مفردیان هەڵیان دەپەرداوت بەنووکی قەلەمبڕێ ، هێندێکیان دەیانکرد بەڕمب و حەیزەران ، هێندێکان دەیانکرد بەنیرۆی دەخەنجەرێ ، ئەوی دەدیکە دەیاندایەوە لەقوببەی دەمەتالی .

پەرچەمت بەمن بمێنن ، بەگولی سوێسن و هەلالەو ، سونبول و خاوێ ، ئەگەر لەسیلەی دەکوێستانێ خۆیان ڕادەوەشاند بە شیبای و بایشەمالی .

گەردنت بەمن بمێنێ ، بەگەردنێ ماینێ شێخی عارەبان ، ئەگەر لە دەشتێ دەکاولە بەغدایە ، کوڕە عارەبان ڕەختیان لێدەدایەوە لەبۆ کاکە مالمالی .

ووردە خاڵت بەمن بمێنن بەوەنەوشەی ساوا ، ئەگەر کەڕی بەیانی سەری خۆیان دێنایەوە دەرێ لەبن ڕنووی دەبەفرێ ، لەسەر گوێیە دەکەندالی .

پانیەت بەمن بمێنن بەقەیسی ئالوێنی ، بەلەکت بە ووڕەی هەلاجی ، سینگت بەمن بمێنێ بەکاغەزی مەرجانی ، چاوت بەوێ ئەستێرێ ئەگەر هەڵدێ لەنێوانێ هەورو سامالی .

بڕۆت بەمن بمێنن بە پانەپەڕو[18] جفەی[19] دەرەشە دالی .

زولفت بەئاوریشمی خاسەڕەنگی خاو ، ئەگەر هەلاوەسرابوو

لەبەر دوکانان ، کەوتۆتەوە دەفتەری توجارو بەقاڵی .
دەیبەنەوە لەبۆ شارەکەی گەرمێنێ ، بەتەرازووی دەیکێشن و دەی فرۆشنەوە بەمسقاڵی .
ئازیزێ ، ئازیزە گوڵێ .

ئەمن سەدایەکم دەگەیشتێ ، لەسەدای دەپیرە پاییزێ ، ئەمن دەچوومەوە بۆ نێو لێڕی ، بۆنێو لێرەواری ،
دەمپرسی لەوێڵوی[20] لە شنێ[21] لەمازوو داری .
دارەبەنم دەدی بەڕووتی ، کەوتم دەدی بەڕەجاڵی ،
دەمگوت : تو خوا ، کەوت ئەتۆ بۆچ واڕووتی ؟ بۆچ وا ڕەجاڵی !
کەوت دەیگوت : ئەتۆ نازانی بۆچی واڕووتم ؟ ! بۆچی وا ڕەجالم ؟ !
ئەگەر سیاسووتی بەهاران شین دەبم لەنێو جەنگەڵو لەنێو لێرەواری ،
ڕاوچیم دێنە سەرێ ، کەوی نێرم پێوە دەخوێنێ ، دەست دەکاتەوە بەوێ گرمەگرمو ، سازو سەمتورو هاوار هاواری .
ساچمە خۆشیەم لەدڵی تەرە[22] دەکەن ، نامێنێ هۆشی ژینێ لەتاوێ دەردوئازاری .
ئەگەر هەوەڵی پاییزێ شەختە لێمدەداو ، لێم دەکاتەوەبە گڕووگڕووی پیرە شەماڵی ،
ئەو گەڵێ پێمەوە لێم هەڵدەوەرێنێ ، پێی دەگرێتەوە زارکی ئەشکەوتی دەزارخاڵی .
ئازیزێ ، ئازیزە گوڵێ .
ئەمن دەچوومەوە کن دارەبەنێ ، دەمگوت : دارەبەن ، ئەتۆ بۆچوا ڕووتی ؟ بۆچوا ڕەجاڵی ؟
دارەبەن دەیگوت . ئەتۆنازانی ، ئەمن بۆچوا ڕووتم ؟ بۆچ وارەجالم ؟ !
ئەگەر نێوانێ بەهارو هاوینان شینکی[23] لێم دەست دەدەنە تەشوێلەی ، لەگەڵ تۆپەڵەقوڕی ، بەجێم دێڵن بەزەلیلی ، بە نەخۆشی ، بەغەمناکی ، بەبرینداری ،
ئەگەر هەوەڵی پاییزێ ، لێم دەداتەوە نمەنمەی بارانی هەقە پەلێ ، لەگە ل گڕوو گڕووی پیرە شەماڵی ،
ئەو گەڵێ پێمەوە لێم هەڵدەوەرێنێو ، ڕایدەداتەوە بۆسەر جۆگەلەو چۆمو ڕووباری .
ئازیزێ ، ئازیزەگوڵێ .

سەرێ من دەێشی ، دڵی منی ماڵوێران بەبێرە بێرە .
ئەوە یارکۆڵەکەم ، جارێکم چاو لێدەکا بەمانگو جارێکی دیکەم لێدەکاتەوە بەئەستێرە .
دەڵێ : هەتیوە لاوە ، ئەگەر نازانی بێیە ئێرە !
ئەتۆ کاوڕێکی بەماڵێ بابی من بسپێرە .
هەموو ڕۆژێ بەبێنووی کاوڕەکەی وەرە ئێرە ،
بەباسکانم لێبگرەوە لابێر لابێرە ،
بەلکەی فەقیانەی کەتانم لەگەڵ بکەوە هاوێر هاوێرە ،
بیستو دوو ڕامووسانان لەگەردنێ زەردو حەلیم بەگیو خاڵ خاڵی بژمێرە ،
بۆ داکو بابی تۆ سەوابیان زۆرە ، بۆ دایی و بابی من دەبێتەوە خێرە .
دەوەرە ، ماڵێبابی من ئازیزێ .
کیژدەڵێ : خۆزگە بەخۆزگەی دەئیمانداران ، ئەمن دارێك بام لەو شەنگە بی یانەی لق شۆڕی سەرەوژێرە ،
ڕوابام لەمێرگی پاراوو شینو زەنوێرە ،
لقێکم ڕۆیشتبا بۆ کوێستانی بڵندو سازگارو ، لقەکەی دیکەم بۆگەرمێنی دەگەرمە سێرە .
هەموو عەسران لەبن لقی دەکوێستانێم ڕۆنیشتبان ، ئەو مەلاو خوندکارو میرو سوارچاکو جوانمێرە ،
نیوەڕۆیان لەبن لقی دەگەرمێنێم ڕۆنیشتبان ئەوسەپانو وەرزێرو ئاودێرە .
ئازیزێ ، ئازیزەگوڵێ .
ئازیز ، ئەمن بۆتۆ هەڵدەڵێمەوە بەکوێستانی گەورەوگرانو بڵندو خاڵخاڵی .
ئەمن بەغیلیە نابەمەوە بەحاجی موحەممەدی دەشتێ ،
ئەگەر بەهاران پارەی بڵاودەکاتەوەو ، پاییزان خڕی دەکاتەوە بەتەلیسو جەواڵی .
ئەمن بەغیلیە دەبەمەوە بەکولەکەی مێردان ، پیسکەی پیاوان ، گیسکێ قەرزداران ، کەلەبابی سەر بارەداری ،
ئەگەر لەدەوروبەری نیوەشەوێدا بەڕیشێکی قژنۆکەو ، بە سمێڵێکی چلماوی ئارەقێ لەسەر سینگو مەمکی ئازیزێ دەماڵی .
ئازیزێ ، ئازیزەگوڵێ .
ئەرێ ئازیزێ ، ئازیزە خانێ ، سینگ سەدەفێ مەمك فنجانێ .

ئەوە دلم ڕاناوەستێ ، لەبەر ئەوێ غەمێ ، لەبەر ئەوێ ژانێ .
ئەمن ئاورێکم بەربوتەوە لەدەروونێ ، لەدەروونە وێرانێ .
نە ـ بە ـ بای دەکوژێتەوە نە بە پریشکەی دەبارانێ .
نەبەپاچ و پێمەڕە گل وەسەردانێ .
هاوارێکم وەبەر خودایو ، ئیدیکەم وەبەر پێغەمبەری ئاخرزەمانێ .
دەوەرە ئازیزی ، ئەتۆ لەمن زیزی .
ئەتۆ ڕەشەڕیحانێکی سەرپەلك سەوزو بن پەلك بە قەنەوزی[24]
ئازیزی ....
کوڕدەڵێ : ئازیز ، ئەتۆ بەلەکت بۆ واجوانن ؟ !
کچ دەڵێ : خانەوێران ، هەموو لەبەر خڕخاڵ تێگێڕانێ .
کوڕ دەڵێ : ئەدی داوودەلینگت بۆوا جوانن ؟ !
کچدەڵێ : تازە هاتوومەوە لەجێژوانێ .
کوڕدەڵێ : ئەدی قەدت بۆچی واباریکە ؟ !
کچدەڵێ : لەبەر قوببەی کەمەرە لێدانێ .
کوڕ دەڵێ : ئەدی گەردنی بلووری عەجەمیت بۆ وابلندە ؟ !
کچ دەڵێ : ئەتۆنازانی دیواری حەساری ماڵێ بابی من بلندە ، هەموو لەبەر گەردن هەلێنانێ .
کوڕدەڵێ : ئەدی سینگت بۆچ وا نەرمو تەختو سپی یە ؟ !
کچدەڵێ : شەوان هەتیوە لاوەکەی خۆم لێی دەگرێتەوە دیوانێ .
کوڕدەڵێ : ئەدی چاوت بۆچی واجوانن ؟ !
کچ دەڵێ : هەموو لەبەر سوورمە تێکێشانێ .
کوڕدەڵێ : ئەدی سەرکوڵەت بۆچی وا سوورن ؟ !
کچدەڵێ : ئەمن دڵ بەدنیامو لەبەر شەو ڕامووسانێ .
دەوەرە ، ئازیزێ ، ئازیزەگوڵێ ...

## لێکدانەوێ ووشان

1 ـ چواس : چیایەکە لەسەرووی ڕۆژهەلاتی قەلادزێ .
2 ـ گۆردو زەرد : گوێی درێژو پان و زەرد ، تایبەتە بۆ ڕەگەزی بزنێ .
3 ـ بەوەیە : بەئازارە .
4 ـ حوندە : زۆرگەورە .
5 ـ ماتی : تفەنگی ماتلی (بەتلی) تفەنگێکی سەر دەمی جەنگی جیهانی یەکەمبووە .
6 ـ چەك : خشل .
7 ـ تێکی هەڵدەدانە : لەدەستی وەردەدان .
8 ـ کوڕکوڕی مەرگێ : خۆشترین و بەرزترین هاوینە هەواری دۆڵێ سەراوێی کانی تووی سەربەناوچەی بنگردە لەپارێزگای سلێمانی .
9 ـ ئەشکەوتێ کەڕواوێ : ئەشکەوتێکی گەورەی شینکایەتی یەیە ، بەهارو پاییزان مەڕداری شینکیانی تێدا دەحەوێنەوە .
10 ـ کانی کەنێر : کانیاوێکە دامێنێ چیای کوڕکوڕی ئاودەدا .
11 ـ مێشێ بەدۆ : ماڵە مەڕی کوێستانان بەزۆریان دۆ لە خۆ زیاد دەبێ و دەی ڕێژن ، مێشی کوێستانێش لەسەر ئەو دۆیەی دەژین ، بۆیە مێشەکان دۆواوین .
12 ـ گوڵێ کابەکرێ : (گۆماوی کاك بەکری) گۆلاوێك بووە کەبۆ ڕاوی شەوارەی کراوە ، شوێنەکەی لەپشتی دەربەندی قەلادزێ بووە ، سوورە قولنگی نامەبەری فەرخۆڵەی مامان کەلەشامێوە هاتۆتە (داودێ) شەوێ لەوکۆلەی میوان بووە .
13 ـ ترکەش و کەوپەر : دوو گوندی مەنگوڕایەتی یەن لەکوردستانی ئێرانێ سەر لەپارێزگای خانێ .
14 ـ کوێستانی برایم جەلالێ : کۆمەڵە کوێستانێکی ڕیزە چیای زمزیرانن لەنێوانێ سەردەشت و سابلاغێ لەکوردستانی ئێرانێ .
15 ـ باژاڕو جەماڵدین ... : کوێستانی کوردستانی ئێرانێن لەنزیکی سنووری پشدەرێ .
16 ـ سپی ڕێزی غەیلانیان : کوێستانی ناوچەی (جەڵدیان)ێن لە پارێزگای خانێ لەکوردستانی ئێرانێ .
17 ـ دەڕزکا : دەڕوا ، ڕەگی دادەکوتا .
18 ـ پانەپەڕ : ئەوپەڕانەن کەدەکەونە بەشی ناوەڕاستی باڵی باڵدارانەوە ، کولکەکەیان نەرمەو سەری پەڕەکان پانە .
19 ـ جفە : ئەو پەڕانەن کەدەکەونە کۆتایی سەرباڵی باڵدارانەوەو کولکەیان ڕوویان لەسەرەوە کردووەو سەری پەڕەکان بە تیژی کۆتایی یان هاتووە .
20 ـ وێلۆ : ڕەگەزێکی دار بەڕوویە ، بەزۆری دمکانەی لێ دەکەن .
21 ـ شن : درەختێکی کوێستانی بێبەرە ، زۆر گەورەنی یە .
22 ـ تەرە : پەراگەندە .
23 ـ شینکی : تیرەیەکن لەنێوانێ ماوەت و دۆڵێدا دەژین لەپارێزگای سلێمانی کەگوندەکانیان ئەمانەن (کەلالە ، سەفرە ، زەروون ، دڕی ، قامیش ، بەرگورد ، شینکی ، باساوێ) .
24 ـ قەنەوز : سەوز .

## سەرچاوەکان

1 ـ گۆرانی بێژو بەیت بێژان : (خدربلوێر ، حەمەکوێر ، سەلیمی بایزی ، ڕەسووڵی مینایی ، برایمی حەمە عەزیزی ، برایمی ئەحمەدی برایمی ، ئەحمەد سەرنێلی خوا لێخۆش بوو) .
2 ـ تحفەی مظفریە بەرگی یەکەم ، نۆسکارمان ـ هێمن .

زانیاری

گۆڕین و ئامادەکردنی
کەمال جەلال غەریب

# تۆمارگەی بووبەردەکان
# «سجل الحفريات»

« بەشی دووەم و کۆتایی »

**گیاندارە خشۆکەکان (زواحف Reptilia ) : ـ**

پۆلی خشۆکەکان دووهەم هەنگاو دەنوێنێت لە هەنگاوەکانی زاڵ بوونی گیاندارە بڕبڕە دارەکان لەسەر زەوی . تۆمارگەی بووبەردەکان چەندەها لقی ئەم پۆلە لەدێرینی میزۆزۆیکدا (سەدەی خشۆکەکان) ئەو ماوەیەی کەزیاتر لە (200) ملیۆن ساڵی خایاندووە بەتایبەتی ئەگەر کۆتایی دێرینی پالیۆزۆیکیشی لەگەڵدابێت . بەتایبەتی لەچاخی پێرمی یەوە کەلە (280) ملیۆن ساڵ لەمەوبەرەوە دەستی پێ کردووە . لەو هەموو ژمارەو جۆرە زۆرەی گیاندارە خشۆکەکان ئێستاکە تەنها کۆمەڵەی کیسەڵەکان (السلاحف) (chelonia) ، مارمێلکەو مارەکان العضایا squamata و سەر لمۆزییەکان « خطرا ،سیات Rhynchocephalians » وەکوو گیانداری سیفینۆدۆن sphenodon و تیمساحەکان ( التماسیح crocodilia ) ماونەتەوە لەسەرەتای دێرینی میزۆزۆیکەوە هەتا ئێستا .

**خشۆکە ووشکاوەکی یە زاڵەکان**
**Dominant terrestrialforms : ـ**

مارمێلکە دێرینەکان واتە خشۆکە زاڵەکان Archosauria ، بەدرێژایی دێرینی میزۆزۆیک ، تەنها هەر خۆیان بوون کەزاڵ بوون لەناوگیاندارە ووشکاوەکی یە کاندا (واتا گیاندارەکانی ئەوسای سەر زەوی) . ئەم کۆمەڵە گیاندارە تیمساح (crocodile) و دینۆ سورەکان و Dinosaur خشۆکە فڕندەکان و (الزواحف الطائرة Flying reptiles) شێوە سەرەتاییەکانی خشۆک Thecodontia دەگرێتەوە . گیاندارە ددان بەرگدارەکان کۆمەڵەیەکی چەقی (مرکزی) (central) لەئەرکوساوریا (خشۆکە زاڵەکان) پێکدەهێنێت . ئەو کۆمەڵەیەی کەخشۆ کەزاڵەکان و باڵندەکانی لێ کەوتۆتەوە ، وەکوو بەناوەکەیدا دیارە ، واتا ددان بەرگدارەکان ، ددانیان وان لەچاڵێکی قووڵدا . شیکۆدۆنتە سەرەتایی یەکان proterosuchians بچووک بوون .

**تیمساح** : ـ لەناوەڕاستی چاخی ترایاسی یەوە دەرکەوتووەو هێشتا هەرماوە . جۆرە دێرینەکانیان بچووک و قەڵغان (درع) قورس بوون لەمارمێلکە دەچوون .

**دینۆ سورەکان (الديناصورات Dinosaurs)** ووشەی دینۆسور لەپێشگری (دینۆ ـ) واتا ترسناك لەگەڵ پاشگری ( ساورس) واتا مارمێلکە پێکها تووە ، کەوابوو مانای ووشەی دینۆسور (مارمێلکەی ترسناك) دەگرێتەوە . دینۆسورەکان سەیرترین گیانداریْ بڕبڕەدار بوون لەهەموو وەختێکدا ولەهەموو جیهاندا بلاو بوو بوونەوەو لەنێوانی کۆتایی چاخی ترایاسی وەبۆ کۆتایی چاخی دەباشیری ژیاون و گەشەیان کردووە ، واتا لەماوەی نزیکەی (150) ملیۆن ساڵدا ژیاون . لەم ماوە دوورو درێژەدا گۆڕانی زۆریان بەسەردا هاتووە چی لە شێوە چی لە قەبارەدا . بچوکترینیان لەقەبارەی کەڵەشێرێکدا بووەو مەزنترینیان درێژی یەکەی نزیکەی (30) مەتر بووەو کێشەکەشی (36 — 50) تەنی مەتری بووە . ووشەی (زاراوی) دینۆسور زاراوێکی دەستکردەو دوو پلەی جیاواز لەمارمێلکە دێرینەکان دەگرێتەوە : ـ پلەی شێوە مارمێلکە (سۆرشیا Saurischia ) و پلەی شێوە باڵندە (ئۆر نیثیسشیا Ornithischia) .

پلەی سۆرشیا بریتی بووە لەگیانداری درندەی وەکوو (ثیرۆپۆدا) Theropoda کەلەچاخی ترایاسیدا دەرکەوتووەو ئۆرنیثۆمیمەس ornithomimus واتا نیمچە ووشترمر (شبيه النعامة ostrichike) و تیرانۆسور Tyrannosaurus کەگۆشت خۆر بووەو

نزیکەی (15) مەتر درێژ بووەو بەرزی یەکەی (6) مەتر بووە ، مانای ووشەی تیرانۆسور دینۆسوری زۆردا دەگرێتەوە .لقی پێ مارمێلکەیی یەکان (ساوروپۆدا sauropoda) لقێکە لەشێوە مارمێلکەیی یەکان گیاخۆر بوون بۆنموونە : ـ (دیپلۆدۆکەس) واتا دینۆسوری گیاخۆر Diplodocus (برۆنتۆسورەس) Brontosaurus کەدینۆسورێکی ئەمریکی مەزن بووەو (براکیۆسورەس) واتا دینۆسۆرە بازوودارەکان Brachiosaurus ئەمانە گەورەترین چوار پێن کەهەتا ئێستا لەسەرزەوی ژیابن . دیپلۆدۆکەس درێژی یەکەی 26/7 مەتربووە جگەلە کلکە درێژەکەی ، بەلام براکێوسورەس (250) مەتر درێژبووەو کێشەکەی (50) تەن بووە .

**ئۆر نیثسشیاکان ornithischians**

ئەم دینۆسورانە لەچاخی جوراسی و دەباشیریدا ژیاون لەباڵندە دەچوون و گیاخۆر بوون و ددانیشیان هەبووە بۆ نموونە : ـ ئۆرنیثۆپۆداکان orni hopodas وستیگۆسورەس (الأسطفور ـ Stegosaurs) کەدینۆسورێکی کەتەی قرتێکەوتووە قەڵغانێکی ئێسکی قورسی هەبووەو ئەنکیلۆسورەس Ankylosaurus (واتا دینۆسورە ڕەقەکان) و ثیراتۆپسیدی ceratopsid شاخدارو ئیگوانۆدۆن Iguanodon کەدینۆسورێکی گەورە بووە شێوەی لەقۆڕی (الضب Iguana) چووەو لەشی دڕکی پێوە بووە بۆ خۆپاراستن لەدوژمن . هەروەها دینۆسورە دەنوکە مراوی یەکان واتا تراکۆدۆنس (دینوصور منقار البط Trachodons) کەلەگیانداری دەنوکە مراوی چووەو بەسەدەها ددانی شێوە گەلایان هەبووە . نموونەی تر بۆ ئۆرنیثۆپۆدەکان دینۆسوری پۆپنەدار واتا (هادرۆسورەس) Hadrosaurus و ئەنکیلۆسورکە لەچاخی دەباشیریدا باو بووەو پێی دەوترێت دەبابەی خشۆك (دبابة زاحفة Reptilian tank) چونکە قەڵغانێکی زۆر قایمی هەبووە هەندێکلە ئۆرنیثشیا شاخدارەکانی چاخی دەباشیری سەریان زۆر گەورە بووە (نزیکەی سێیەکی لەشیان بووە) وەکوو گیانداری تریسیراتۆپسید Triceratopsid کە بووبەردەکەی لەووڵاتی مەنگۆڵیا دۆزراوەتەوە .

دینۆسورەکان لەچاخی دەباشیریدا هەر بەردەوام بوون بەلام زۆربەی جۆرەکانیان لەکۆتایی ئەم چاخەدا کتوپڕ نەماون واتا قڕیان تێکەوتووە . دەبێت ئەمەش بزانین کەگیانداریکی خشۆکی قڕ تێکەوتوو هەبووە لەشێوەی ماسیدا بووە ناوی ئیکثیۆسۆرس Ichthyosaurus بووە . چەند تیوری یەك Theory دانراوە بۆلێکدانەوەی قرتێکەوتنی دینۆسورەکان لەوانەش گۆڕانی باری ئاوهەواو شوێنەوارو دەرکەوتنی گیاندارە شیردەرەکانە . هەرچەندە کەئەم تیوری یانە هیچ کامێکیان بەتەواوەتی جێگەی ڕەزامەندی نیە .لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین کە قرتێکەوتنی دینۆسورەکان هەربەشێوەی مەتەڵێکی (واتا نهێنی یەك) مەزن لە نهێنی یەکانی مێژووی سروشتدا ماوەتەوە . دێرینی ناوەڕاست (الدهر الأوسط Mesozoic) کەبەدێرینی دینۆسورەکان دادەنرێت شتێکی ئەوتۆی لێنازانرێت ئەوپەیکەرە مەزنانە نەبێت کە ئێستا لەمۆزەخانەی زانیاری یە سروشتی یەکاندا (متحف العلوم الطبيعية) لەبەریتانیاو ئەمەریکا دانەن لەگەڵ بووبەردی هێلکەی (بيضة متحجرة) دینۆسورەکان کە بە توێکڵێکی کلسی ئەستور داپۆشراون . دینۆسورەکان لەچاخی تریاسیدا دەرکەوتوون بەلام لەپێشدا بچووك بوون بەقەبارەی پشیلەو سەگی ئێستا بوون بەلام کلکیان درێژ بووەو لەقاچەکانیاندا سێ پەنجە هەبووە وەك لەچینە نیشتەنی یەکانی زەوی هەندێك شوێندا دەرکەوتووە . چاخی جورا سی و چاخی دەباشیری بەسەدەی زێڕینی (العصر الذهبي Golden age) دینۆسورەکان دادەنرێت ، چونکە لەم چاخەدا بەتەواوەتی گەشەیان کردووە بەجۆرێکی ئەوتۆ کەبەرزیی هەندێکیان گەیشتۆتە (10) مەترو درێژی یەکەیان (25) مەتر . هەرچەندە کەبەمارمێلکەی ترسناك ناودەبرێن بەلام لەڕاستیدا زۆر لەو گیاندارانە ترسناك نەبوون و جەوریان لەگیاندارەکانی تری ئەو وەختە نەکردووە چونکە بەزۆری گیاخۆربوون ، کەمێکیان نەبێت کەگۆشتی گیانداری تریان خواردووە وەکوو تیرانۆسور Tyrannosaurs کەدرێژی یەکەی (15) مەترو بەرزی یەکەی (6) مەترو درێژی سەرەکەی زیاتر لەمەترێك بووەو ددانی تیژو گەورەی هەبووە . ئەوانی تر بێوەی بوون بەڵکو تەنانەت لەخۆشیان ترساون بۆیە لەشیان بەدڕکی تیژیان تەبەقی کرکراگەیی ئەستورو پارێزەر داپۆشراو بووە بەتایبەتی وەکوو (دایمیتریدۆن) Dimetrodon واتا (پلیکۆسۆرەس) ـ Pelycosauria کە گیانداریکی گۆشتخۆری زۆر سەیر بووە ئەندامێکی شێوە چارۆکەی هەبووە بە پشتی یەوە بەدڕکی گەورە تەنراوە لە چاخی پێرمیدا ژیاوە . دینۆسورەکان لە بەشی سەرەوەی چاخی دەباشیریدا لە پڕێکدا لەسەر زەوی وون بوون و لەو ساکەوە پەیکەرە بووبەردەکانیان لەچاخەکاندا

(چینەکانی زەویدا) نەبینراون ، ئەم کارە بووە هۆی سەرسورمانی زاناکان کە هەریەکە لەلایەنی خۆیەوە لێکدانەوەیەکی بۆئەم کارەساتە داناوەو گرنگترینی ئەم لێکدانەوانەش ئەمانەن : -

1 — هەرچەندە لە پێشدا دینۆسۆرەکان بچووك بوون بەلام لەدواییدا زۆر کەتەیان لێدەرچووە . هەرچەندە کەزۆر کەتەش بوون بەلام عەقلیان کەم بووە بەڕادەیەکی ئەوتۆ کەمێشکیان بەقەدەر هێلکەی مریشکێك بووە ، واتا ئەو مێشکە بچووکە نەیتوانیوە کەکارو فرمانی ئەو لەشە زلە بەڕێت بەڕێوە لەبەر ئەوە بەکۆمەڵ قڕیان تێ کەوتووە .

2 — زۆربەی دینۆسورەکان ڕووەك خۆر بوون . کاتێك کەباری ئاوو هەوا بەرەو ناهەمواری گۆڕاوە وەدەریاکان خشاونەتە سەر زەوی‌و ئەو ڕووەك‌و گیایانەی داپۆشیوە دینۆسورەکان تووشی قاتی هاتوون‌و بەهیلاك چوون .

3 — دینۆسورەکان گیانداری کەمڕژەڵ (غبي) بوون هێلکەی ئەوتۆیان لەوناوەدا ، واتا لەسەر زەوی یان لەناو زەلکاوەکاندا کردووە کەکێشی هەریەکێکیان دوو کیلۆگرام‌و درێژی‌یەکەی نزیکەی یەك‌پێ بووە ، بەبێ ئەوەی ئەو هێلکانە بپارێزن . لەبەر ئەوە ئەو هێلکانە بەرە بەرە لەناو چوون‌و ژمارەی دینۆسورەکان بەوپێ‌یە کەمی کردووە .

4 — لەبەر ئەوەی کەکۆئەندامی دەماریی (الجهاز العصبي Nervous System) ئەم گیاندارانە بەفرمانە گرنگەکانی وەکو هەناسەدان‌و هەرس کردن‌و دەردان‌و .... هتد خەریك بووە ، ئەم گیاندارانە بەرە بەرە ئارەزووی پەڕین‌و زاووزێ‌یان وون کردووە بۆیە وردە وردە لەناوچوون‌و قڕیان تێ کەوتووە . لەگەڵ ئەوەشدا لەم دوایی‌یەدا لەکیشوەری (قارّە) ئوستەرالیا گیاندارێك دۆزراوەتەوە لەدینۆسورچووە بەقەدەر مەڕێك بووە ، لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە : - تۆبڵێی هەندێك لە دینۆسورە دێرینە مەزنەکان وایان لەخۆیان کردبێت خۆیان گۆڕی‌بێت‌و قەبارەیان بچووك بووبێتەوەو خۆیان لەگەڵ باری ناهەمواری ئەو وەختەدا گونجاندبێت‌و مابنەوەو بەم شێوەیان لێهاتبێت‌و بەردەوام بووبن لەوکیشوەرەدا کەلەکیشوەرەکانی تر - جیابوونەتەوە ؟

خۆشترین شت کەدەیگێڕنەوە دەربارەی دینۆسورەکان ئەوە بوو کە هەندێك لەماسی گرەکان لەسکۆتلەندە ووتوویانە کەوا گیانداریکی کەتەیان دیوە لەدینۆسور چووە هەندێك جار سەر ئاوی گۆمی لوخ نیس Loch Ness دەکەویت‌و لەپڕێکدا خۆی لەئاوەکەدا نقووم دەکاتەوە کەکۆمپانیای ویسکی سکۆچ Scotch Whisky بەمەی زانی خێرا بڵاوی کردەوە کەوا ئامادەیە یەك ملیۆن پاوەن پاداشت بدات بەو کەسەی کەئەم دینۆسورە بە زیندوویتی یان مردوویتی بگرێت ، بەلام هەتا ئێستا ئەنجامی ئەم کارە دەرنەکەوتووە . لەدوا لێکۆڵینەوەی سالی 1977 دا هەندێك لەزاناکان وای‌ڕادەگەیەنن کەدینۆسورەکان قڕیان تێ نەکەوتووە بەڵکو گەشەیان کردووەو خۆیان گۆڕییوە بۆگیانداری‌تر ، هەروەها دەڵێن کەهەندێك لەودینۆسورانە زۆر زیرەك‌بوون‌و مێشکیان گەورەبووە بەقەدەر تۆپێکی پێ‌بووەو ڕووەك خۆرەکانیان ڕەنگیان سەوزو دڕندەکانیان ڕەنگیان خۆڵەمێشی بووە .

## « گەشەکردنی دینۆسورەکان »

### ثیکۆندۆنت Thecodonts

کۆمەڵەی ئۆرنیثیسشیانس Ornithischians — کۆمەڵەی سۆرشیانش Saurischians

کۆمەڵەی ستیگۆسورەس Stegosaurs — کۆمەڵەی سوروپۆدس Sauropods — کۆمەڵەی ثیراپۆدس Therapods

کۆمەڵەی ئۆرنیثۆپۆدس Ornithopods — کۆمەڵەی ئەنکیلۆسورس Ankylosaurs

کۆمەڵەی سیراتۆپسیان Ceratopsians

**تێبینی : -**

1 — ثیکۆدۆنت : - کۆنترین دینۆسورە کەلەسەر زەوی ، لەچاخی تریاسیدا واتا « 230 » ملیۆن سال لەمەوپێش

دەرکەوتبێت .

2– کۆمەڵەی سورو پۆدس : ـ جۆرە دینۆسـوریکی قەبـارە گەورە بوون .

3– کۆمەڵەی ثیراپۆدس : ـ جۆرە دینۆسوریکی قەبارە بچووك بوون .

4– کۆمەڵەی ستیگـۆسورس : ـ دینـۆسوریکی گـەورە بووە درێژییەکەی « 7 » مەتر بووەو پشتی جـووتێك تـەبەقی کرکراگەی پێوە بووە .

5– کـۆمەڵەی ئـۆرنیثۆ پـۆدس : ـ جۆرە دینـۆسوریـك بووە لەئاویش و لەسەر زەویش ژیاوە .

6– کۆمەڵەی ئەنکیلۆ سورس : ـ جۆرە دینۆسوریك بووە لەشی تەبەقی پارێزەری درکاوی پێوە بووە .

7– کـۆمەڵەی سیـراتۆپسیـان : ـ جۆرە دینـۆسوریـك بووە درێژییەکەی « 7 » مەتر بووە سەرزل و گیا خۆر بووە .

## خشۆکە فڕندەکان (الزواحف الطائرة Flying reptiles )

پلەی پتیرۆ ساوریا Pterosauria واتا خشۆکە باڵدارەکان (زواحف مجنحة Pterodactyls یان خشۆکە فڕندەکان لەچاخی جوراسی و لە چاخی دەباشیرییەوە زانراون واتا دەرکـەوتوون کـۆمەڵەی پتیـرۆساوریـاو کـۆمـەڵەی بـاڵنـدەکـان Birds هـەردووکیـان لەئیکۆدۆنتەوە گەشەیان کردووەو ، ئەو خشۆکانە دەنوێنن کەلە هەوادا زاڵبوون ، بەلام لەگەل ئەوەشدا پتیرۆساوریا کەمتر سەرکەوتوو بوون و بەر لەکۆتایی چاخی دەباشیریدا قڕیان تێ کەوتووە . باڵە لاکێشەییەکانیان بریتی بوون لە پەردەیەکی پێستی بەسەر قۆڵیانەوە . شێوە جوراسییە هەرە کۆنەکانیان وەکـو رامفـورینکـەس Ramphorynchus کلکێکی زۆر درێـژی هـەبـووە . لەکلکی گیـانـداری خشـوك چـووە . نمـوونـەی پتیرۆساوریا دوایینە هـەرە گەورەکـان پتیرۆ دۆنت Pterodonts (ددان باڵی یەکان = جناحية الاسنان) بووە کەماوەی نێوانی هەردوو باڵەکەی بەکراوەیی (7) مەتر بووەو پۆپنەیەکی درێژی لەپشتی سەریدا هەبووە .

## باڵندەکان (الطیور = Birds)

لەبـەر ئەوەی کـەباڵنـدەکان تـەرزێکی تایبـەتییان هـەبووە لەژیاندا ، زۆر بە دەگمەن بەشێوەی بووبەرد دەست دەکەون ، چونکە پەیکەرەکەیان زۆر رەق نیەو دوای مردن خێرا دەڕزێن ، هـەنـدێـك بـاڵنـدەی دەریـایی نـەبێتکـە لەنیشتـەنییـە دەریاییەکاندا بەشێوەی بـوو بەرد پـارێزراون . نـەبوونی بووبەردی باڵندەکانیتر دەبێتەهۆی چـاپێکی (دامغەیـەکی) ناتەواو بۆ دەرکەوتنیـان لەتۆمـارگەی بـووبەردەکـاندا . سێ نموونە بوو بەردەکەی باڵندەی ئەرکیـوپتریکس Archaeo Pteryx (باڵندەیەکی سەرەتاییە لەخشۆك چووە) کەلە کۆتایی چاخی جوراسیکدا لەناوچەی (سۆلنهوفن) لەئەڵمانیـادا بینراون بـە تـەواوی ڕاستی باڵنـدە خشۆکـە سەرەتـایی یـەکـان ڕوون دەکەنەوە پەڕیان هەبووەو کلکیان درێژ بووەو لەچەناگەیـاندا ددانیان هەبووە . ئەو جۆرە باڵندانەی کـەلە کۆتـایی چاخی دەباشیریدا دەرکەوتـوون واتا بـاڵندە دەریـاییەکـان وەکو هێسپرۆنیس Hesperonis کە درێژییەکەی (2) مەتر بووەو لەزۆر ڕەوشتدا پێشکەوتوو بووە بەلام هێشتا هـەر ددانی هەبـووە لەدەنوکیدا . هەتا ئێستا (20) هەزار جۆر لەباڵندە زانراوە هەر چەندە کەژمارە شێوە بووبـەردەکانیـان کەمـە ، بەلام ئـەوە دەزانرێت کەئەم کۆمەڵە گیاندارە لەچاخی سێهەمدا (Tertiary) پەیدا بوون و گەشەیان کردووە ، بەتایبەتی گەشەکردنی جۆرە گەورەکانیان کە توانای فڕینیان نەبووە هەر وەکوو ووشترمری (نعامة Ostrich) ئیمڕۆ . ئەو جۆرە توانای گەشەکردنی هەبووە ، بەتایبەتی لەو شوێنانەی کەگیانداری دڕندەی تیادا نەبووبێت و پێویستی بەفڕین نەبووە بۆخۆ رزگار کردن لەمەترسی و ڕاستی ئەمە لە مەدەغشقەرو نیـوزیلەندەدا ڕوویداوە ، ئـەوە بوو کەباڵندە فیلەتەنی یە (Elephant birds) مەزنەکان وەکوو ئیپیۆرنیس Aepyornis وەموا Moa و ـ دینۆرنیس Dinornis هەتا بەرە بەیـانی مێژوو ژیاون ئەوە بوو لەلایەن ئادەمیزادەوە لەناوبران ، جگە لەپـەیکەری بـاڵنـدەی پتیـرانـدۆن Pterandon وفـۆرۆراکـۆس Phororhacos کە درێژییەکەیان مەترو نیوێك بووەو لەسەر زەوی ژیاون جگەلە باڵندەی ئێکثیۆرنیس (الاکثور Ichthyornis کەددانی هەبووە .

## شیردەرەکان واتا مەمکدارەکان (الثدییات او اللبائن)

The Mammals

ـ : ـــــــــــــ

ئەو گیاندارە شیردەرانەی کە ئێستـاکە زینـدوون و خوێنیـان

گەرمە دەکرێن بەسێ بەشەوە (کۆمەڵەوە) : ـ شیردەرە هێلکەکەرەکان (اللبائن البیوضة Prototheria) یان تاككونەکان (احادیة الفتحة Monotremata) ئەمانەتەنها یەك کون لەلەشیاندا هەبووە بۆپیسایی و میزو مادەی رەگەزیی وەکوو گیانداری مێرووله خۆر (آکل النمل Anteater) و شیردەرە تورەکە دارەکان (کیسیات ـ Pouched mammals) یان (Marsupialia) و شیردەرە وێلداشدارەکان placentalia یان plaeental mammals بەلام بەپێی ئەوزانیاری یە فراوانەی کەئێستاکە هەیە دەربارەی چەندەها شیردەری قرتێ کەوتوو وادەردەکەوێت کە ئەم جۆرە دابەش کردنەی کەکەمێك لەمەو پێش وباسمان کرد مەیانێکی تەسکی هەیە . تاك کونەکان خراونەتە ژێر لقێکەوە ـ (Subclass) کەپێی دەووترێت شیردەرە هێلکەکەرەکان (اللبائن البیوضة Prototheria ) لێرەدا پێشگری (Proto —) بەمانای سەرەتایی ، پاشگری (Theria —) بەمانای گیاندار (حیوان ـ بهیمة) دێت هەندێك شێوەیان لەچاخی میزۆزۆیکدا ژیاون و خراوەتە ژێر لقێکەوە پێی دەووترێت (Allo Theria) واتە ـ (گیاندارە جیاوازەکان) لەگەڵ تورەکەدارەکان و وێلداشدارەکان کەخراونەتە ژێر لقی ـ (Theria) واتە (گیاندارە) و ئەمەی دوایی دەکرێت بەدوو کۆمەلەوە : ـ

میتاثیریا Meta Theria واتە تورەکە دارەکان Marsupialia لەگەڵ ئیوثیریا (Eutheria) وێلداشدارە راستەقینەکان واتە وێلداشدارە ئاسایی یەکان Placentalia . رەوشت و شێوە کۆنەکانی شیردەرەکان : ـ واتا شێوەی پەیکەرو ددانی شیردەرەکان ، چونکە تەنها هەر ئەو بەشانەن کەدەشێن بپارێزرێن . کۆنترین شیردەر کەلەچاخی ترياسی یەوە دۆزراونەتەوە لەوولاتی چین بووە . ئەوپاشماوانەی کەلەدێرینی میزۆزۆیکەوە بۆمان ماونەتەوە زۆرکەمن ، دەبێت ئەوەش بزانین کەزەحمەتیشە تەنها هەرچەناگەو ددان بخرێنە ژێر خوێندن و لێکۆڵینەوە وە لەرووی زانیاری زیندەوەرەوە ، دیارترینی ئەو گیاندارە دێرینانە تریکۆنۆ دۆنتەکان (Triconodonts) بوون کە (سێ) ددانی چوکڵەداریان هەبووە ، هەروەها مەلتیتیوبەر کولاکان (Multituberculata) واتە چەندەها سەلکۆکەکان یان چەندەها گرێکان کەددانی گەورەی تەخت و چەند ریزێك لەچوکڵەیان هەبووە . دەشێت ئەمانە گیاخۆر بووبن ، تەنها کۆمەڵەی مەلتیتیو بەرکولاکان کۆمەلەی سەرکەوتوو بوون لەناو ئەلۆثیریاکانداو هەتا سەردەمی ئیوسین ژیاون هەروەها پانتۆثیریاکان (Panto theria) کە (سێ)ددانی خڕی ی چوکڵەداریان هەبووە لەچاخی جوراسیدا هەبوون . دەشێت ئەم کۆمەلە باوك و باپیری تورەکە دارەکان و وێلداشدارەکان بووبن . وێلداشدارەکان لەچاخی دەباشیریدا دەرکەوتوون . ئەو گیاندارە تورەکەدارانەی کەلەئۆپۆسۆم (Opposum) (گیانداری‌کی ئەمریکی شیردەری تورەکەدارە لەکاتی مەترسیدا خۆی دەکات بەمردوو) دەچن لەسەرەتای چاخی سێ‌هەمدا لەباشووری ئەمریکاو ئوستەرالیادا باوبوون ، لەو کاتەدا کەئەم دووکیشوەرە لەئەمریکای باکووری و ئاسیا جیابوونەتەوە . دابەش بوونی کۆمەلەی وێلداشدارەکان لەچاخی دەباشیری یەوە دەستی پێ‌کردووە . پلەی شیردەرە بالاکان (سەرەکی یەکان) (رتبة اللبائن المقدمة أو الرئیسة Primates) : ـ شیردەرە بالا واتە (پێشەنگەکان) دێرینەکان دارو درەخت نشین بوون لەناوچەی ئیستوائی یەکاندا ژیاون و پاشماوەی بوو بەردیان زۆر بەدەگمەن هەیە . ئەو رەوشتانەی کەتایبەتین بە شیردەرە بالاکان وەکوو پەلی بچووك و تایبەتمەندو (متخصص) ددان و گەورەیی قەبارەی مێشك و بینینی تەنداریی (رؤیة مجسمة Stereo scopic sight) (ئەم دیاردەیە لەشێوەسەرەتایی یەکاندا نەبووە ) . شیردەرە بالاکان دەکرێن بەم بەشانەوە : ـ

1 — پرۆسیمی Prosimii کەلەیمور Lemur دەگرێتەوە .
2 — ئەنثرۆپۆیدیا Anthropoidia واتا لەمرۆڤ چووەکان (شبیهة بالانسان) . ئەمیش مەیمونە کلك درێژەکان و Monkeys مەیمونە کولەکان واتە (کلکیان نیە یان کورتە) Appes و مرۆڤ دەگرێتەوە .
3 — تارسیویدیا Tarsioidea واتە قوله پێ دارەکان .

لیمۆرەکان لەسەردەمی ئیوسینیدا دەرکەوتوون . لەوە دەچێت کەکۆمەلەی نیمچە مرۆڤەکان لەسەردەمی ۆلیگۆسینیدا دەرکەوتبن ، بە تایبەتی مەیمونە کلك درێژەکان لەسەردەمی ئۆلیگۆسینی یەوە دەرکەوتوون . کۆمەلەی لەمرۆڤ چووەکان (شبیهة بالانسان Hominoidea ) کەمەیمونە کولەکان و مرۆڤ دەگرێتەوە مێشکێکی گەشەکردوو تریان هەیە . لەوە دەچێت کە

ەندێك پاشماوەی تایبەتی لەسەردەمی ئیوسینەوە کەلەمیسرو ورمادا بینراوە باوكو باپیری مەیمونە کولەکانبن . نموونەی ەو مەیمونە کولانەی کەلەسەردەمی میوسینو پلیوسیندا ژیاون ەیمونی (پروکونسول) ە Proconsul کە نزیکە لە باوكو باپیری ەیمونە کولەکانو مروڤەوە . گرنگترین ڕەوشتی مروڤی کون ەوە بووە کەتوانیویتی ئامراز لەبەرد دروست بکات ، ئەم جورە امرازانە لەبەرە بەیانی سەردەمی پلیستوسینەوە زانراون . پاشماوەی مروڤ زور کەمو پەرشو بالاوە . چونێتی گەشەکردنی ئەم کومەلە کارێکە بەزەحمەت دەسەلمێنرێت .

**پلەی دڕندەکان (رتبة الضواري Carnivores) : ـ**

بەوە دەناسرێن کەگوشت خورن چونکە ددانی تایبەتمەندیان ەیە پێی دەوترێت ددانە بڕەبڕەکان (Carnassials) شێوە کونەکانی چاخی سێهەم (Tertiary) بەشێوەیەکی گشتی لەکومەلەیەکی جیاوازدا دانراون پێی دەوترێت کومەلەی کریو دونتا (Creodonta) کەلە سەردەمی ئیوسینیدا گەشەیان کردووە . گیاندارەکانی پلەی دڕندەکان لەکوتایی سەردەمی ئیوسینو ئولیگو سیندا لقیان لێ بوتەوە . ئەم لقانە (شێوانە) بەدرێژایی سەردەمی ئیوسین لەمێژوو خورەکانەوە (Insectivores) گەشەیان کردووە ، ئەمانە قەبارە بچوکترو مێشك گەورەتر بوون وەك لەکریو دونتا هاوسەردەمەکانیان . دڕندەی پێشکەوتووتر کەکومەلەی مشکی خورماو (عرسيات = Mustellids) کومەلەی سەگ دەگرێتەوەلە سەردەمی ئولیگو سیندا دەرکەوتوون . وورچ لە سەردەمی میوسینو گیاندارە لە پشیلە چووەکان . catlike لەسەردەمی ئیوسینو پشیلە ڕاستەقینەکان لەسەدەمی ئولیگوسیندا دەرکەوتوون . لەهەموویان گەشەکردووتر پشیلە ددان خەنجەرییەکان (Sabre — toothed) (مسیفة الاسنان) کەلە سەردەمی پلیستوسیندا بەردەوام بوون . پێپەڕەکەییە (زعنفية الاقدام) (Pinnipeds) ئاوییەکانی وەکوو گوێرەکەی دەریا (عجل البحر = فقمة Seal) (کەگیاندارێکی شیردەری گوشتخوری دەریاییە لەماسی دەچێت .. ) کەددانیان چوون یەك بووە لە سەردەمی میوسین بەم لاوە زانراون . نەهەنگە یەکجار گەشە کردووەکان پلەیەکی تایبەتی پێکدەهێنن هەرچەندە کەشێوەکانی سەرەتایی چاخی سێهەمیان وەکو پاسیلو سورەس Basilosaurus کەنزیکەی (17) مەتر درێژ بووە دڕندەیەکی ماسی خور بووە پلەی شیردەرە

**سمدارەکان (الظلفيات = ذوات الحافر)**

**Hoofed mammals = Ungulates**

بریتیە لەچەند شێوەیەکی هەمە جورەی گیاخور لە شیردەرەکانی چاخی سینوزویك ، ئەمانە بەجورێکی ئەوتو گونجاون کەددانیان هەر بو خواردەمەنی هاڕین بوون . سمدارەکانی ئێستا دەکرێن بەچەند بەشێکی سەرەکییەوە : ـ جووت سمەکان (شفعية الاظلاف = مزدوجة الاظلاف = Artiodactyla) دووانیان چوار سمیان هەیە وەکوو کومەلەی مەڕو بزن .... هتد . وەتاك سمەکان (وترية الاظلاف = مفردة الاظلاف Perissodactyla) لەگەل بەشی ژێر سمدارەکان Subungulato کە دیار ترین نموونەیان بریتیەلە کومەلەی قورتمدارەکان (خرطوميات Proboscidea) . ئەومادە بوو بە بەردیانە کەدەست مروڤ کەوتوون وای دەردەخەن کەژمارەیەکی زور لە شیوەی تری سمدارەکان هەبوون جگە لەمانەی ئێستا ، بەتایبەتی لەچاخی سێهەمدا . لەهەمان کاتدا ئەم بووبەردانە مەوزوعی پول کردنی (تصنيف) سمدارەکانیان ئالوز ترکرد چونکە پولینی جاران پشتی تەنها بەچەند شێوەیەکی زیندووی کەم دەبەست . سمدارە سەرەتایییەکان کەمێشکیان بچووك بووەو ددانیان زور جیاواز نەبوون لەیەکتری خراونەتە کومەلەیەکی جیاوازەوە کەپێی دەوترێت سمدارە سەرەتایییەکان Protongulata وگرنگترین ئەمانەش کوندیلارثراکانن (Condylar thra) لەمانەش گیانداری فینا کودەس Phenacodus کەلەسەردەمی ئیوسیندا ژیاوە . جگە لەو شوێنانەی کە لەسەردەمی پالیوسیندا ژیاون وەکوو گیانداری تێترا کلاینودێن (Tetra claenoden) کەدەشێت باوکو باپیری چەندەها سمداری گەلێك پیشکەوتوو تری دواوە بێت .

لەنێوانی سمدارە دێرینەکاندا جورێکی سەیر هەبووە کە لەشێکی قورسو پێیەکی پانی هەبووە بەهێواشی دەڕویشت پێی دەوترێت پانتو پود panto pod ، جگە لە گیانداری یونیتاثیروم unitatnerium کەقەبارەی بە قەدەر کەرکەدەنێکی ئیستا بووە . هەتا سەردەمی ئیوسین ژیاون . کومەلەی قورتمدارەکان Proboscidea فیلو هەندێك گیانداری تردەگرێتەوە . هەندێك لەو شێوانەی کەلە سەردەمی میوسیندا ژیاون لەهەردوو شەویلکەکەیاندا کەلبەیان (مايى = عاج

Tusk) هەبووە وەکوو ترایلۆفۆدۆن Trilophodon و هەندێکی تریان تەنها لەشەویلگەی خوارەوەدا مایی یان هەبووە وەکو لە گیانداری دینوثیریۆم Deinotherium . ماستۆدۆنەکان Mastodons کە لەفیل چوون لەسەردەمی ئۆلیگۆسیندا دەرکەوتوون بەلام قەبارە مەزنەکانیان کەکەلبەی زۆر گەورەیان هەبووە لەسەردەمی پلیستۆ سیندا پەیدا بوون ، ئەو تیوری یانەی کەدەربارەی پەیدابوون و گەشەکردنی گیاندارە تاك سمەکان Perissodactyla هەن بەتایبەتی لەبەشی خوارەوەی چاخی سێ هەمدا راستی یەکەیان بەبووبەردی دۆزراوە بەباشی سەلمێنراوە ، بەزۆری لەباکوری ئەمریکادا . بۆنموونە ئیستاکە دەتوانرێت چۆنێتی گۆران و گەشەکردنی ئەسپ لەبەشی خوارەوەی سەردەمی ئیۆسینەوە هەتا ئێستا دەربخرێت : ـ ئەسپی هیراکو ثیریۆم (HyracoTherium) کە لەسەردەمی ئیۆسیندا ژیاوە درێژی یەکەی نزیکەی یەك پێ بووەو لەقەبارەی رێوی یەکی بچوکدا بووە ، هەرپەلێکی چوار سمی هەبوو کە ئەمە بەکۆنترین ئەسپ دادەنرێت لەسەر زەوی وە ئەمە گۆراوەو بووەبە ئەسپی میشوهیپس (میسۆهیپس Mesohippus = Meshohippus) لەسەردەمی ئۆلیگۆ سیندا درێژی یەکەی نزیکەی (2) پێ بووەو هەر پەلێکی سێ سمی هەبووە ئەمیش گۆراوە بۆ ئەسپی میری چیپەس (Mery chippus) یان پاراهیپەس Parahippus کەلەسەردەمی میۆسینداژیاوەو درێژی یەکەی نزیکەی (3) پێ بووەو هەر پەلێکی سێ سمی هەبووە ئەمیش بووە بەئەسپی پلیۆهیپەس Pliohippus یاهیپاریۆن کەلەسەردەمی پلیۆسیندا ژیاوە درێژی یەکەی نزیکەی (4) پێ بووەو هەر پەلێکی یەك سمی هەبووە ، ئەمیش بووە بەئەسپی ئیکوەس Equus یان ئەو ئەسپەی کەئێستا هەیە کەلە سەردەمی پلایستۆسیندا ژیاوەو درێژی یەکەی (5) پێ یەو هەر پەلێکی یەك سمی تێدایە . تیثانۆثیریس Ti thanotheres کەگیاندارێکی یەکجار سەیر بووەو هەتا سەردەمی ئیوسین و ئۆلیگۆسین ژیاوە ، لەوگیاندارە سەرەتایی یەوە گەشەی کردووە کەلەئەسپ چوە . گیانداری برۆنتۆثیریوم کەدوای ئەو دەرکەوتوون گیاندارێکی کەتەبووە چوکلەیەکی بەسەرەوە بووە لەقۆچ (شاخ) چووە کەرکەدەنەکانیش Rhinoceroses لەچاخی سێ هەمدا باوبوون و لەتاپیرە Tapir دێرینەکانەوە گەشەیان کردووە . ئەو شێوانەی کەلە سەردەمی ئیۆسیندا ژیاون خۆیان بۆ راکردن گونجاندووە ، بەلام ئەوانەی دوای ئەمان زۆر کەتەیان لێ دەرچووەو هەندێکیان شاخیان هەبووە (شاخەکەلە تۆپەلە موو بووە نەوەك لە ئێسك) ، هەندێکیشیان بێ شاخ بوون وەکوو (بالوچیثیریۆم) Balochitherium کەلە سەردەمی ئۆلیگۆسیندا لە مەنگۆلیا ژیاوەو مەزنترین گیاندار بووە کەلەسەر زەوی ژیابێت ، شانی (5/5) مەتر واتا (18) پێ لەزەوی یەوە بەرز بووە .

پلەی جووت سمەکان Artiodactyla ژمارەیەکی زۆرلە شیردەری ژیاوی گەورەی تیادایە . ئەم کۆمەلەیە خێرا لەسەردەمی ئیۆسیندا گەشەی کردووە بەتایبەتی لەبەشی کۆتایی چاخی سینۆزۆیکدا بوون بەکۆمەلەیەکی زاڵ گەلێك زیاتر لەتاك سمەکان کەلە سەرەتایی چاخی سێ هەمدا گەیشتبوونە ئەو پەری گەشە کردنیان پلەی جووت سمەکان دەکرێت بە (3) کۆمەلەی سەرەکی یەوە : ـ کۆمەلەی بەرازەکان Suina کەبەرازوو پێکاری Peccary و (گیاندارێکی ئەمریکی یە لەبەراز دەچێت) ماینی (ئەسپی) ئاویی (فرس النهر Hippopotamues) و ئەنثراکۆسیریس Anthracotheres وکۆمەلەی کاوێژ کەرەکان (المجترات Ruminantia = Cudchewers) کەزۆرترین شێوەکانی تر دەگرێتەوە وەکوو ووشترو ئاسك و ووشتر بەلەك (زرافة Giraffe) و رەشەوولاخ وچەند شێوەیەکی قر تێ کەوتوو پالایۆدۆنتا Palaeodonta ، ئەمیش ئەو شێوانە دەگرێتەوە کەلەسەرەتایی چاخی سێ هەمدا ژیاون .

بەرازە سەرەتایی یەکان لە سەردەمی ئیۆسیندا دەرکەتوون . ئەنثراکۆ سیریسەکان لەناوەراستی چاخی سێ هەمدا گەشەیان کردووە ، هەندێکیان ژیانێکی تەر ووشکی واتا لەناو ئاوو لەسەر زەویشدا ژیاون وەکوو ، ماینی ئاویی . لەناو کاوێژ کەرەکاندا ووشترو لاما llama (گیاندارێکە لەباکوری ئەمریکا دەژی لەووشتر دەچێت بەلام بچووکترەو دوگی نیە ) لەبەشە دوایینەکەی چاخی سێ هەمدا باوبوون . شێوە دێرینەکانیان تراگۆلۆیدس Traguloids لە سەردەمی ئیۆسیندا دەرکەوتوون و کۆمەلەی ئاسك لە سەردەمی پلیۆسیندا ، بەتایبەتی فیلە کێژەی ئێرلەندی (الآیل الایرلندي) (Erish elk) کەشاخەکانی لقدارن باوبووە . رەشە ولاخیشی واتا گاو مانگا Borids لەسەردەمی ئۆلیگۆسیندا دەرکەوتوون و لەبەشی دوایینی چاخی سینۆزۆیکدا گەشەیان کردووە . پلەی دەم پووچەکانیش واتا بێ ددانەکان (الدرداوات) Edentata کەگیانداری تەمەلی درەخت

سلان السجرة Treesloth) (کەئێستاش هەر ماوە) و گیانداره یدارەکان (الحیوانات المدرعة Armadillos) ومێرووله خۆرەکان کلات النمل Anteaters) دەگـرێتەوە لەچـاخی سیۆزۆیکـدا له مریکای باشووریدا گەشەیان کردووه ، ئەوبووبەردانەی که زراونەتەوە وای دەر دەخەن کەئەمانە له بەرە بەیانی چاخی ـەمدا ، لەئـەمریکـای باکـوری‌یەوە بـەرەو ئەمـریکـای شووری چوون بەرلەوەی که ئەم دوو کیشوەرە لەیەکتـری یاببنەوە گلایپتۆدۆنتەکان Glyptodonts کەنزیکن لەو زرێدارانەی بستاو زری‌ی (قەڵغانی) قایمیان هەبووە لە کیسەڵ دەچوون ، ێوە گەورەکانی تریش وەکوو ـ تەمـەڵی زەوی (میگاثیـریۆم Megatheriu) کەله سەردەمی پلیوسیندا ژیاوە لەفیل گـەورەتر ـووە [ درێـژی‌یـەکـەی نـزیکـەی (6) مـەتـر بـووە ] پلەی ـرتێنەرەکـانیش Rodentia کەزۆرتـرین شیردەرەکـانی ئێستا ەگرێتەوە . ئەم گیاندارە بچووکە گیاخۆرو Herbivorous و گیاو ۆشت خۆرانە Omni vorous لە هەموو کۆمـەڵە گیانـدارێکی تر وانیویانە خۆیان لەگەڵ شوێنەواری ئێستادا بگونجێنن . وادەر ەکەوێت کەئەمانە لەکۆتایی چاخی میـزۆزۆیکدا لەگیـانداره ێروو خۆرەکانەوە گـەشەیـان کردبێت . مشـك لەسەردەمی ۆلیگۆسین‌و کەروێشك لەکۆتایی سەردەمی ئیـوسیندا پـەیدا بووە .

## پەراویزەکان

1 — (ڕادیۆلاریا) واتا گیانداره تیشکدەرەکان (الشعاعیات) .
2 — (فۆرامنیفیرا) واتە گیانداره شانۆچکە دارەکان (مخرمات) .
3 — مەبەست لەدێرین (دهر Era) وەختێکی جیۆلۆجی‌یە بەسەر خرۆکی زەویدا تێپەڕبووە .
4 — دێـرینی سینۆزۆیـك واتا ژیـانی نـوێ (الحیـاة الحـدیثـة) (Modren life = Cenozoic) کە نزیکەی (66) ملیۆن ساڵی خایاندووە .
5 — دێـرینی میزۆزۆیـك واتا ژیـانی نـاوەڕاست (الحیـاة الوسـطی) (Middle = Mesozoic) کە (160) ملیۆن ساڵی خایاندووە .
6 — دێرینی پالیۆزۆیك واتا ژیانی کۆن (الحیاة القدیمة) (Paleozoic = Ancient life) کە نزیکەی 345 ملیۆن ساڵی خایاندووە .
7 — دێرینی بەرلەکامبری Precambrian (ماقبل الکامبری) کە (4030) ملیۆن سـاڵی خایاندووە .
8 — مەبەست لەچـاخ (حقبة Period) وەختێکی جیـولۆجی‌یە بـەسەر خـرۆکی زەویدا تێپەڕ بووەو بەشێکە لەدێرین .
9 — چاخی چوارەم Quaternary (2/5) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە لەدێرینی سینۆزۆیك .
10 — چاخی سێهەم Tertiary کە (63) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە لەدێرینی سینۆزۆیك .
11 — چاخی دەباشیری Cretaceous کە (71) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە له دیرینی میزۆزۆیك .
12 — چاخی جوراسی Jurassic کە (54) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە لەدێرینی میزۆزۆیك .
13 — چاخی تریاسی Triassic کە (35) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە له دێرینی میزۆزۆیك .
14 — چاخی پێرمی Permian کە (55) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە لەدێـرینی پالیۆزۆیك .
15 — چاخی کاربۆنی (خەلوزی) کە (65) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە لەدێرین پالیۆزۆیك .
16 — چاخی دیڤۆنی Devonian کە (50) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە لەدێرینی پالیۆزۆیك .
17 — چاخی سیلۆری Silurian کە (35) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە لەدێرینی پالیۆزۆیك .
18 — چاخی ئۆردۆڤیسی Ordovician کە (70) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە له دیرینی پالیۆزۆیك .
19 — چاخی کامبری Cambrian کە (70) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە لەدێرینی پالیۆزۆیك .
20 — مەبەست لەسەردەم (عصر Epoch) وەختێکی جیۆلۆجی‌یە بەسەر زەویدا تێپەڕ بووەو بەشێکە لەچاخ .
21 — سـەردەمی هەلۆسـین Holocene (10) هەزار سـاڵی خایـاندووەو بـەشێکـە لەچاخی چوارەم .
22 — سەردەمی پلستۆسین Pleistocene کە (2/5) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە له چاخی چوارەم .
23 — سەردەمی پلیوسین Pliocene کە (4/5) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە له چاخی سێ هەم .
24 — سەردەمی میوسـین Miocene کە (19) ملیـۆن ساڵی خـایانـدووەو بەشێکـە لەچاخی سێهەم .
25 — سەردەمی ئۆلیگۆسین Oligocene کە (12) ملیون ساڵی خایاندووەو بەشێکە له چاخی سێ هەم .
26 — سەردەمی ئیۆسین Eocene کە (16) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە له چاخی سێهەم .
27 — سەردەمی پالیۆسین Paleocene کە (11) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بەشێکە له چاخی سێهەم .

سەرچاوەکان

هەمان سەرچاوەکانی بەشی یەکەم

● نافع كاكه ●

# مێـــژووی ســـاڵنـامـەو
# ڕۆژژمـێـــری کـــوردی

### بەشی دووەمو
### کۆتایی

بەو شێوەیە ساڵی کوردی لە مانگی نـەورۆزەوە ڕا دەست پێ دەکاتو لە مانگی ڕەشەمێ کۆتایی دێت ئەوەی لێرەدا لە ڕۆژ ژمێری کوردی جیاوازی هەبێت لەگەڵ ڕۆژژمێرەکانی تر ئەوەیە کەوا ڕۆژژمێری کوردی شەش (6) مانگی بەرایێ ی (31) ڕۆژنو شەشی دووایش (30) ڕۆژن تەنهـا مانگی دووایی (ڕەشـەمێ) نەبێت (29) ڕۆژە بە چوار ساڵ جارێك سەبارەت بـە ساڵی پـڕ دەبێتە (30) ڕۆژ . مانگەکانیش بەو شێوەی خوارەوە ڕیز بوونەو ناوەکانیشیان سەبارەت بە کاتەکـەوە ناونـراون بەو شێـوەی خوارەوە کەوا لە وەرزی بەهار ڕا دەست پێ دەکات : ـ

**مانگەکانی وەرزی بەهار**

بەهار یەکەمین وەرزە لە چوار وەرزی ساڵ بە پێ ی ئاوو هەوای نیوەی باکوری گۆی زەمین لەو ڕۆژەوە دەست پێ دەکات کە خۆر دەچێتە کەلووی شەك لە 21 ـ ی ئازارەوە *[69] کە ڕۆژی وەرگەڕانی بەهـاری پێ دەووترێو شـەوو ڕۆژ بەرامبـەرنو ڕۆژی جەژنی نەورۆزە *[69] لە 1 ی خاکەلێـوەدا لەو وەرزەدا خۆر لە کەلووی شـەکەوە دەچێتـە کەلووی (گـا) و کەلووی (جمك) یەك لەدووای یەك مانگەکانیش بەو شێوەیەن : ـ

**1 ـ نەورۆز — وێنەی شەك — صورة الحمل**

خاکەلێوە ، ئاخەلێوە ، ئـادار ) یشی پێ دەڵێن (31) ڕۆژە *[70] یەکەمین مانگی بەهارو مانگی یەکەمی ساڵە بەرامبەر کەلووی شـەك لە (نەو + ڕۆز) دروست بـووە واتـا ڕۆژی نـوێ و سەبارەت بە ناوی جەژنی نەورۆزەوەیە کەوا لە یەکەم ڕۆژی ئەو مانگـە دایە و ڕۆژی ڕزگـار بوونـە لە سەرمـاو سۆڵەیی و زەقیقـەتی زستانو جـەژنی ڕزگاری یـە لەدەستی زوڵمو زۆر داری و دیلیەتی *[71] هەروەها جەژنی دارو درەخت و سەرەتای چـەکەرە دانی بـەرهەمی کشتـوکاڵ و داهـاتنی بـەرهـەمی ئاژاڵ یە *[72] خاکەلێوە و ئاخەلێوە [73] هەردووان یەکن لە (خاك + لێو) هاتووە (خاكو ئاخ) واتای زەوی یە یان خـۆڵ واتای خشانی لێوی ئاژاڵ لە خاك * [74] ئاداریش [75] لە (ئاو + دار) دروست بووە بەکرتاندنی (و) کە ئەو کاتەی ساڵ تەڕاتی ئاو بە لەشی دار دا دێتەوە و چەکەرە دەداتەوە .

**2 ـ گوڵان — گا — الثور**

(بـانەمـەڕ و شەبـاران [76] یشی پێ دەڵێن (31) ڕۆژە [77] مانگی دووەمی بەهار و دووەمی ساڵە بەرامبەر کەلووی گا لە (گوڵ + ان) دروست بووە کاتێ لە مانگی ڕابووردوو دا سەرەتای شین بۆونی بەروو بوومی کشتوکاڵ بووە سەبارەت بە لەباری ئاوو هەواوە * [78] بە تایبەتی دانەوێڵەی پۆلی گەنم و جۆ دەست بە پێکهێنانی گوڵ دەکەن [79] (فەریك) کە بە گوڵەجۆ یان گوڵەگەنم دەناسرێت و پێکهاتنی مادەیەکی ڕەنگ شیری لینج لەناو گوڵەکە کەوا سەرەتای دروست بوونی دانی فەریکەکەیە لەبەر ئەوەی لەو مانگەدا گوڵی دانەوێڵەی ئەو پۆلە پەیدا دەبێت بۆیە پێ ی دەڵێن مانگی (گوڵان) . بانەمەڕیش لە (بان + مەڕ) پێکهاتووە (یان) بەواتای دەشت و دەر لەو مانگـە دا مەڕداران مـەڕ و ماڵاتیان دەبەن بۆ بانان ([80] و زۆر بەکەمی دەیان گەڕێننەوە ئاوایی چونکە لەبان لەوەڕگا و پاوان زۆرە پێـویست بە ئـالیك دانیان ناکات لەماڵەوە و هەر لەبان تێر لەوەڕ دەبن و خۆشیان نیمچە ماڵێك دەبەن ، لەبەر ئەوەی لەو ماوەیەدا ئـاژەڵداران مەڕو و ماڵاتی دەبەن بۆ دەشت و دەر دەڵێن (بانەمەڕ) هەر بەو مانگە (شەستە باران) یشی پێ دەڵێن [81] کە لە (شـەست +







جمك



قرژال

باران) دروست بووه بۆیەش وا بەو کاتە دەڵێن چونکە لە ڕۆژێکا زۆر جاران باران دەبارێتو دەبێتەوە هەتاوێکی خۆش [82] ووشەی (شەستکردن) زۆر جار سەبارەت بە زۆری بەکار دێت لەسەر شێوەی فرمانی کراو (شەستکردن) جا لەبەر ئەوەی لەو دەمەی ساڵ (باران شەست ـ دەکاتن) دەڵێن شەستە باران .

**3 — جۆ زەردان  جمك  الجوزاء**

(باران بڕان [83] و بەختە باران [84]) یشی پێ دەڵێن (31) ڕۆژە [85] بەرامبەر کەلووی جمك مانگی سێیەمی بەهار و سێیەمی ساڵە لە (جۆ + زەرد) دروست بووە بەواتا کاتی جۆزەرد بوون [86] . هەرکە مانگی ڕابووردوو (گوڵان) کاتی پەیدا بوونی گوڵی جۆو دانەوێڵەی ئەو پۆلە بوون ئەوا لەو مانگەشدا گوڵەکان تەواو دەبن * [87] . وە ووشكو ڕەق دەبن و ڕەنگیان زەرد هەڵ دەگەڕێت لەو مانگەدا بە تایبەتی گوڵە جۆ یاخود فەریکە جۆ [88] لەوانی تر زووتر پێ دەگات بۆیە بەو کاتەی ساڵ دەوترێت جۆزەردان .

(باران بڕان) یش لە (باران + بڕین ← بڕ) هاتووە کە لەو کاتانەدا باران بەرە و کەم بوونەوە دەبێت و دەبڕێت [89] و چیتر نابارێت مەگەر بەڕێکەوت و کەمی نەبێت سەبارەت بە بڕانی باران لەو مانگەدا ناونراوە مانگی (باران بڕان) . هەروەها لەو کاتەی ساڵدا باڵندەیەکی لە پۆلی چۆلەکەدا پەیدا دەبێت ڕەنگی ڕەشێکی خۆڵەمیشی یە کە کەوتە سەر زەوی ناتوانێ بڕاوت و بفڕێتەوە تا یەکێ هەڵی نەداتەوە ئاسمان لەبەر وەدەرکەوتنی ئەو باڵندەیە لەو دەمەی ساڵدا کەباران بڕانە ناونراوە (باران‌بڕە) واتە هەرکە ئەو باڵندەیە پەیدا بوو ئیتر باران دەبڕێت و چیتر نابارێت . هەروەکو لە سەرەوە وتمان ئەوکاتەی ساڵ بارانی لێ دەبڕێتو نابارێت مەگەر بەدەگمەنو بە ڕێکەوت نەبێت هەر بۆیەش بەوکاتەی ساڵ دەڵێن (بەختە باران) [90] لە (بەخت + باران) هاتووە واتە ئەو بارانەی لەو دەمەی ساڵ دەبارێت بەختە وەك بڵێن فلانە کەس بەختی هەیە چونکە لەو کاتەی ساڵ باران دەبڕێت و بە شێوەیەکی ئاسایی نابارێت تەنها ئەوەیە جارو بار دەبارێت ئەوەش بەشی زۆری لە ناوچەی کوێستاندا [91] .

**مانگەکانی وەرزی هاوین (تاوسان)**

دووەمین وەرزی ساڵە بە گوێرەی ئاوو هەوای نیوەی باکوری گۆی زەمین خۆر لەو وەرزەدا دەچێتە کەلووەکانی (قرژال ـ شێر ـ فەریك) یەك لەدووای یەکدا لە 22 / ی حوزەیرانەوە مانگەکانی ئەووەرزە (پووش‌پەڕ ـ خەرمانان ـ گەلاوێژن) [92] .

**4 — پووش پەڕ  قرژال  سرطان**

(پووش‌کاڵ) یشی پێ دەڵێن (31) ڕۆژە چوارەم مانگی ساڵەو یەکەم مانگی هاوینە خۆر دەچێتە کەلووی قرژال (پووش‌پەڕ و پووش‌کاڵ [93] لە (پووش + پەڕین ← پەڕ) و (پووش کاڵ بوون) دروست بوونە ، بە واتا لەوکاتانەی ساڵدا لە بەر وشك و برنگی تینی گەرمی پووش زۆر وشك و ناسك دەبێت و لە بەر وشکی ڕەنگەکەی (کاڵ) هەڵدەگەڕێت و لەبەر ناسکی ئەگەر قاچی ئاژاڵ و چارەوی پێ بکەوێت (دەپەڕێت) جا لەبەر ئەوەی‌لەو مانگەدا پوش ڕەنگی کاڵ دەبێت و لەبەر ناسکی دەپەڕێت بەو مانگە دەڵێن (پووش کاڵ) یان (پووش پەڕ) هەروەها لە نیوەی ئەو مانگەدا بای (هوڕە) یاخود (شەرا) هەڵ دەکات بۆ ماوەی نزیکەی دوو مانگ بایەکی یەکجار گەرمەو [94] پێچەوانەی بای شەماڵ هەڵ دەکات هەروەها لە 25 / ی ئەو مانگەڕا دەکەوینە سەر چلەی هاوین کەوا چل (40) ڕۆژی ناوەڕاستی وەرزی هاوینە کەوا ئاو و هەوا زۆر گەرم و برنگین دەبێت .

**5 — خەرمانان  شێر  الاسد**

(خەرمانان . خزیران [95] پێنجەم مانگی ساڵەو دووەم مانگی هاوینە بەرامبەر کەلووی شێر [96] هەروەها (جۆخینان و زەخیران) یشی پێ دەڵێن (31) ڕۆژە و ناوەکان هەموو لە یەکترەوە نزیکن ، لە (خەرمان + ان) (جۆخین + ان) (زەخیرە + ان) دروست بووە . دووای ئەوەی بەروو بوومی دانەویلەی پۆلی گەنم و جۆ دروێنە دەکرێت ئەنجا لە پارچە زەویەکی تەختایی کۆی دەکەنەوە کەوا بۆ ئەو مەبەستە ڕێکخراوەو پێی دەڵێن (جۆخین) پاش کوتانی بەرهەمەکە بە گێرەو جەنجەڕ کردن ئەنجا دانەوێڵەکە لە کا و کۆت و کۆزەرەکەی بە شەنە باکردن لێك جیا دەکرێتەوەوبە بەرهەمی تازە پەیدابوو دەوترێت (خەرمان) بۆیەش بەو کاتەی ساڵ دەوترێت خەرمانان یان جۆخینان . هەروەها (زەخیران و خزیران) یش یەك ناون لە زەخیرەوە هاتووە و بۆتە خەزیران و خزیران بەواتای کاتی



شێر


فەریك


کەوان


گیسك

هەڵگرتن و لە عەمار کردنی بەروو بوومی دانەوێڵەی پێویستە بۆزستان ، ئەو مانگە زۆر گەرمە لە گەرمیان زیان لە زۆربەی بەرهەمی کشتوکاڵی دەدات[97] و هەمووی بەر چلەی هاوین دەکەوێت .

**6 – گەلاوێژ فەریك العذراء**

شەشەمین مانگی ساڵەو سێیەم مانگی هاوینە (31) ڕۆژە بەرامبەر کەلووی فەریك[98] تەنها پێنج ڕۆژی بەر چلەی هاوین دەکەوێت لە دووای ئەو ماوەیەدا ئیتر ئاوو هەوا گۆڕانی بەسەردا دێت بەتەواوی بەتایبەتی لە کۆتایی دا فێنك دەبێتو شەوانیشی سارد دەبێت – سەبارەت بە ئەستێرەی گەلاوێژ ئەو ناوەشی لێنراوە کەوا گەلاوێژ (زهرة – Venus) پێش هەڵاتنی خۆر بەسێ کاژمێر هەڵدێت لە مانگی ئەیلول دا[99] ئەستێرەیەکی زۆر ڕۆشنە بەهاسانی جیادەکرێتەوە لە دووای هەسارەکانی تەرازوو هێشتا شەوی دەمینێ هەڵدێ[100] . شایانی باسە ئەو ئەستێرەیە دووەمین هەسارەکەیە بە گۆیرەی دووری لە ڕۆژو لە دووای عەتارید (Mercury) دێتو نزیکترین هەسارەشە لە زەوی کاتێ لە خولی نێوان ڕۆژو زەویدا دەبێتو کەمترین ماوەش دووری لە زەوی (25000000) ملیۆن میلە[101] .

**مانگەکانی وەرزی پایز (خەزان)**

سێیەمین وەرزی ساڵە خۆر دەچێتە کەلووی (تەرازوو – دووپشك) – کەوان) یەك لە دووای یەکدا مانگەکانی (ڕەزبەر – گەلاڕێزان – سەرماوەز) ن[102] .

**7 – ڕەزبەر تەرازوو الميزان**

حەوتەمین مانگی ساڵو یەکەم مانگی پایزە[103] بەرامبەر کەلووی تەرازوو (30) ڕۆژە لە (ڕەز + بەردان ← بەر) هاتووە بەواتای لەوکاتەی ساڵ ڕەز بەردەدات .

**8 – گەلاڕێزان دووپشك العقرب**

(خەزەڵوەر – گەلاخەزان – سەرپەڵە) شی پێ دەڵێن هەشتەم مانگی ساڵو دووەم مانگی پایزەو (30) ڕۆژە بەرامبەر کەلووی دووپشك[104] لە (گەلا + ڕێز) کردنەوە هاتووە کەوا ئەوکاتەی ساڵ خەڵك گەلاو چرۆی داران کۆ دەکەنەوەو ڕێزیان دەکەن بەنیازی هەڵگرتنیان بۆ ئالیکی زستانەی ئاژاڵیان . هەروەها (خەزەڵ – وەر) یشی پێ دەڵێن لە (خەزەڵ – + وەرین ← وەر) وە هاتووە بەواتا گەلاوەرین کە لەو دەمەی ساڵ گەلا دەوەرێتو (گەلاخەزان) یش[105] هەر بەهەمان واتاوە دێت – هەروەها (سەرپەڵە) ش بەو دەمەی ساڵ دەووترێت[106] لە (پەڵەدان) هاتووە واتای زەوی پالاو بوون بەهۆی ئاوی بارانەوە ، سەرپەڵە بەسەرەتای پەڵە دان دێت واتە ئەو کاتەی ساڵ سەرەتای ئەوەیە زەوی پالاو ببێت بەهۆی باران بارینەوە کەوا لەو ماوەیەدا باران ووردە ووردە دەبارێت[107] .

**9 – سەرماوەز کەوان القوس**

نۆیەمین مانگی ساڵەو سێیەم مانگی پایزە (30) ڕۆژە بەرامبەر کەلووی کەوان[108] لە (سەرما + وەرز) هاتووە واتە وەرزی سارد کە ئەو کاتە ئاوو هەوا ساردەو بارانیشی لێ دەبارێت .

**مانگەکانی وەرزی زستان (جستان)**

وەرزی کۆتایی ساڵە بە گوێرەی ئاوو هەوای نیوە گۆی باکوری زەمین خۆر لەو وەرزەدا دەچێتە کەلووی (گیسك – دوڵچە – نەهەنگ) دا کەوا لە زەوی دوور دەکەوێتەوەو تیشکی بە لاری بەر ئەو نیوە گۆیە دەکەوێتو مانگەکانی (بەفرانبار – ڕێبەندان – ڕەشەمێ) ن .

**10 – بەفرانبار گیسك الجدي**

دەیەمین مانگی ساڵەو بەرامبەر کەلووی گیسكو یەکەمین مانگی زستانەو (30) ڕۆژە لە (بەفر + بارین ← بار) وە هاتووە[109] . چونکە ئەو کاتەی ساڵ ئاسایی بەفری لێ دەبارێتو دووای تێپەڕینی (25) / ڕۆژ بەسەر ئەو مانگەدا دەکەوینە سەر چلەی زستان کەوا ئاوو هەوای زۆر ساردە .

**11 – ڕێبەندان دوڵچە الدلو**

یازدەمین مانگی ساڵە بەرامبەر کەلووی دوڵچەو دووەمین مانگی زستانەو (30) ڕۆژ[110] . لە (ڕێ + بەندبوون) ەوە هاتووە بەواتا ڕێگا گیران و داخران لەبەر کۆبوونەوەی بەفر لە سەر ڕێگاکاندا یان ئەوەتا بەفر زۆر دەبارێتو هەموو دەشتو دەر دادەپۆشێتو هیچ وشکایی و خاك بە دەرەوە نامێنێ لە بەر بەفر بۆیە ڕێگە لە کاروانچیان دەگیرێتو تێك دەچێت ئەگەر زۆر


تەرازوو


دووپشك


دوڵچە



نەهەنگ

شارەزا نەبن لەکاتی وا دەربچن ئەوە ، لەوانەیە بە شوێنی نزمایی وادا بڕۆن کە بە بەفر پڕ بووتەوەو تیوەی بچن و لە ناوبچن سەربارەت بەوەی لەوکاتەی ساڵدا هات و چۆ کەم دەبێتەوە وەك بڵێی ڕێگە بگیریت و دابخرێت بەند دەبێت بۆیە بەو دەمە دەڵێن ڕێبەندان وەهەروەها هەمووشی بەر چلەی زستان دەکەوێت .

**12 — ڕەشەمێ نەهەنگ الحوت**

(ڕەشەما ـ ڕەشەمە ـ کوڵەمانگ) یشی پێ دەڵێن مانگی کۆتایی ساڵەو کۆتایی زستانیشە (29) ڕۆژە ، لە ساڵی پڕدا بە چوار ساڵ جارێك دەبێتە (30) ڕۆژ[111] لە (ڕەش + مێ) یان لە (ڕەش + مانگ ← ما ← مە) وەهاتووە ، چونکە لەو مانگەدا گیانەوەری یۆلی پشیلەو ڕێوی بەبا دێن (بەفاڵ هاتن) بە کۆمەڵ کۆمەڵ دووای یەك دەکەون و هەڵبەزین و وارە وارو شەڕە شەقەکی وا دەکەن بەتایبەتی پشیلە کەوا حەسانەوە لە خەلك حەرام دەکەن بۆیە دەڵێن (ڕەشەمێ) بەواتا سەبارەت بەمێ یەی پشیلەکان ئەو ڕۆژە ڕەشەیە پەیدا دەبێت[112] . هەروەها لە (ڕەشەمانگ) یش دێت کە ئەو وەختەی ساڵی لەبەر شین بوونی گیاو گوڵ دەشت و دەر ڕەنگی ڕەش هەڵدەگەڕێت کە لەو مانگەدایە بۆیە دەڵێن ڕەشەمانگو بووەتە (ڕەشەما) و (ڕەشەمە) ناوی (کوڵەمانگیش)[113] هەر بەو واتەوە دێت . شایانی باسە لە سەرەتای ئەو مانگەوە پەنگرەکان (پشکووەکان) دەکەون کەوا پەنگری هەوا لە 1 / ی ڕەشەمێ دکەوێت و پەنگری ئاو لە (8) ی ڕەشەمێ دەکەوێت و پەنگری زەویش لە (15) ی ڕەشەمێدا دەکەوێت ، وە لە 11 ی ئەو مانگە لە حەوتەی پەنگری زەویدا بای وادە (وەعدە) هەڵ دەکات کەوا نیشانەی هاتنی نەورۆزەو ئەو بایە کاتێ هەڵ دەکات کەوا (18) ڕۆژی بمینێ بۆ نەورۆز[114] هەروەها پێنج ڕۆژی سەرەتای ئەو مانگەش بەر چلە دەکەوێت ، دەربارەی چلەش لە ڕۆژ ژمێری کوردیدا جیاوازی هەیە لە گەڵ ڕۆژژمێرەکانی تر ، ژمێریاری کوردی (40) چل ڕۆژی ناوەندی زستان یان هاوین بە چلە دا دەنێت کاتێ (25) ڕۆژ بەسەر مانگی یەکەمی زستانێدا تێپەڕی واتە لە 25 ی بەفرانباری ڕا مانگی ڕێبەندانیش هەموو لەگەڵ (5) ڕۆژی مانگی ڕەشەمێ بۆ چلەی هاوینیش هەروا لە (25) ی پووش پەڕێ ڕا مانگی خەرمانانیش هەمووی و (3) ڕۆژیش

| مانگ | بەرزترین | نزمترین | تێکڕایی |
|---|---|---|---|
| لەوەرۆز | 17.9 | 7.0 | 12.45 |
| گوڵان | 25.1 | 11.35 | 18.25 |
| جۆزەردان | 32.0 | 16.0 | 24.0 |
| پووشپەڕ | 37.05 | 20.9 | 28.97 |
| خەرمانان | 39.0 | 22.9 | 30.95 |
| گەلاوێژ | 37.65 | 21.15 | 29.32 |
| ڕەزبەر | 32.55 | 16.75 | 24.65 |
| گەلاڕێزان | 23.75 | 10.75 | 17.25 |
| سەرماوەز | 13.5 | 4.2 | 8.85 |
| بەفرانبار | 9.1 | 0.2 | 4.65 |
| ڕێبەندان | 8.85 | 1.25- | 3.8 |
| ڕەشەمێ | 11.75 | 1.25 | 7.5 |

تێکڕایی پلەی گەرمی ساڵانە بە پێوەری سەدی

لە مانگی گەلاوێژ بەر چلەی هاوین دەکەوێت ، گەلاوێژ تەنها (3) سێ ڕۆژی بەر چلە دەکەوێت چونکە مانگەکانی وەرزی هاوین هەموویان (31) ڕۆژن . لە ڕۆژژمێری کوردیدا تەنها یەك چلە هەیە بۆ هەر یەك لە زستان و هاوین بەڵام هەندێ ژمێریار دووای ڕێچکەی ڕۆژ ژمێری تر دەکەون بەوەی چلەی گەورەو چلەی بچووك لە ڕۆژژمێری کوردیدا دەژمێرن ئەویش بەوەی چل (40) ڕۆژی بەرایی زستان یان هاوین بە چلەی گەورە دادەنێن و چل (40) ڕۆژی دووایی هەریەکە لەو وەرزانە بە چلەی بچووك دادەنێن[114] ئەوەش لەگەڵ ڕۆژژمێری کوردیدا ناگونجێت چونکە هەبوونی چلەی گەورەو بچووك تەنها بۆ ئەو ناوچانەیە کە ئاوو هەوایەکی گەرمیان هەبێ و تەنها لە ساڵدا دوو وەرزی هاوین و زستانیان بەهاسانی لێك جیا بکرێتەوەو دوو وەرزەکەی تر . (بەهارو پایز) زۆر کورت بن و هەریەکە یان لە (1 — 3) هەفتە زیاتر نەبن کەوا لە سەرەوەدا باسی ئەو جۆرە ئاوو هەوایە کراوە ، لە بەر ئەوەی وولاتەکەمان ئاوو هەوایەکی دەریای سپیانەی هەیە و تێکڕایی پلەی ئاوو هەوای لەگەڵ هەبوونی دوو چلەدا ناگونجێت .

له چلەی زستاندا چەند حەوتەیەك هەیە كەوا لەحەوتە ساردەكانن و كەش تیایاندا زۆر سارد دەبێت لە كوردەواریدا بە حەوتەكان ناو دەبرێن . ئەگەر دوو چلە هەبێت ئەوە حەوتەكان تەنها سێیانیان بەرچلەی گەورە دەكەون (ئەوانیش هەندە سارد نین وەكو ئەوانی تر) حەوتەكانی تریش بەر چلەی بچوكی زستان دەكەون كەوا چل (40) ڕۆژی دوایی زستانە و بەرەو بەهاریش دەچێت ئاوو هەوایەكەشی وەكو چلەی گەورە سارد نیە لەگەڵ ئەوەش حەوتەكان سارد ترن لە سێ (3) حەوتەكانی پێشەوەیان . بە هەبوونی دوو چلە زۆربەی حەوتەكان بەر چلەی بچووك دەكەون بەتایبەتی حەوتەكانی (بەرخندەو مێرەم) كە لە حەوتە هەرە ساردەكانی زستانن و دەبێت لە سارد ترین كاتی وەرزی زستان بن و بكەونە چلەی گەورەوە . وە ژمێرە كردنی حەوتە زۆر ساردەكانیش دەكەونە ناوەندی چلەی زستانەوە ئەو كاتەیە كە چلەی زستان (40) چل ڕۆژی ناوەندی زستان بێت و شوێن پێی كەس نەكەوین چونكە هەر شوێنێ لەگەڵ شوێنێكی تر سەبارەت بە هەڵكەوتن و باری جوگرافیایی ئاوو هەوای جیاوازی هەیەو دەبێت ژمێرەكردنی جیا جیاشیان هەبێت و تێكڕایی ئاوو هەوای وولاتەكەمان وەربگرین و نەوەك هەر یەكە بەئارەزووی خۆی ژمێرەكردنی (ڕۆم و عەجەم و عەرەب) بەكار بهێنن و بخرێتە ناو ڕۆژ ژمێری كوردی یەوە ..

دەربارەی ناوی (حەوتە) لەگەڵ (هەفتە) دا جیایە هەفتە بە شەممە دەست پێ دەكات و لە هەینی كۆتایی دێت بەڵام حەوتە مەرج نیە وابێ تەنها حەوت ڕۆژەو لەكاتێكی دیاری كراوی ساڵدان و كەش تیایاندا زۆر سارد دەبێت و دەكەونە چلەی زستان و پلەی گەرمایی زۆر نزم دەبێتەوە لێیان بۆیەش لە ژماردنی ڕۆژەكانی ساڵ بە كاریان دەهێنن لەبەر گرنگی ئەو ڕووداوە سروشتی و ناسروشتی یانەی تیایاندا ڕوویان داوە بەوە وە بوونە هۆیەكی ناسینەوەی كات و دەمی ساڵ كەوا هەریەكە یان ناوی تایبەتی خۆی هەیە ، ناوەكان و ژمارەی حەوتە كانیش لە هەموو شوێنێكی وڵاتەكەمان وەكو یەك نینە لەبەر فراوانی و هەبوونی ناوچەی لێك داپچڕاوی سەبارەت بە هۆ یەكانی جوگرافی و لووتكە شاخی زۆر بەرزو شیوو دەشتی كاكی بەكاكی تیایە كەوا ئەوانەش كار دەكەنە سەر دابەش بوونی ناچوون یەكانەی ئاوو هەوا بێ گومان لووتكە شاخی بە بەفر داپۆشراوو قەدپاڵ و نسارو دەشتی گەورەو فراوان ئاوو هەوایان چوون یەك نابێت بەڵكو ئاوو هەوای زۆرساردو فێنك و گەرمیان دەبێت ، ئەو ناوچەیەی ساردە لە كاتێكی دیاری كراوەوە ناوێكی هەیە بۆ حەوتەیەك ، شوێنە گەرم و فێنكەكانیش هەریەكەیان ناوێكیان هەیە بۆ هەمان حەوتە جا ئەو هۆیانە وایان كردووە لە شوێنە ساردەكان زووتر دەست بە ژمێرەكردنی حەوتەكان بكرێ و درەنگتریش كۆتایی یان پێ بهێنرێت چونكە وەرزی زستان لە هەندێ ناو چەدا بەتایبەتی لە كوێستان و باكوری كوێستاندا درێژەو زستانی زوو دەست پێ دەكات و درەنگیش كۆتایی دێت[115] كەوا درەنگتریش كۆتایی پێ دێت بە حەوتە حەوتەی دووای یەك لە هەرێمە فێنكەكان و هەرێمە فێنكەكانیش زووتر لە هەرێمە گەرمەكان دەست پێ دەكات و درەنگتریش لە وان كۆتایی یان پێ دێت بۆیە ژمارەی حەوتەكان لە هەرێمە ساردەكان زۆرترە لەهی هەرێمەكانی تر . سەبارەت بەوەشە ناوی حەوتەكانی یەك كاتیش جیاوازیان هەیە لە نێوانیان . سەرەڕای ئەوەش لە كۆندا هۆیەكانی ڕاگەیاندن نەبووە كەوابكات ناوی حەوتەكان وەكو یەك بێت و لە ڕۆژێكی دیاری كراویش بەیەكەوە دەست پێ بكەن و ئاشكرایە كە ئەو هۆیە ڕاستەو خۆ كاری هەیە كەوا خەڵكی هەرێمە لەیەك دوورەكان ئاگاداری ژمێرەكردنی یەكتر نەبوونە تا زانیاری یەكتر لەو بارەیەوە بزانن . بۆ نموونە ئیمڕۆ حەوتەیەك لێرە ناوێكی هەیە بە پێی ئەو ناوچەیەی وا تیادا ین كەچی لە شوێنێكی تر لە وانەیە دووای چەند ڕۆژێك بەهەمان ناوەوە دەستی پێ بكەن لە گەڵ ئەوەش ناوچەی وا هەیە هەفتەیەك زووتر لە ئێمە بەهەمان ناو بەسەریدا تێپەڕیون ، یان وادەبێت ناوەكان وەكویەك نینە بەڵام هەمان واتا دەگەیەنێ و لەجێگەی هەمان حەوتە بەكار دێت سەرەڕای ئەوانەی باسكران ناوو بەرواری ئەو حەوتانە یەكێ لەیەكێكی تری وەرگرتووە یان لە نەوەیەك بۆ نەوەیەكی تر بەهۆی قسەو زارە وەهاتووە ، ئەوە ڕێی تێ دەچێت هەندێ لە بیر بكرێت و هەندێ زیاد بكرێت و ناوەكانیش بە پاش و پێش بگوترێت . جگە لە وانەش چەند ڕۆژێكی سنووردار هەیە دەكەونە هەندێك لە حەوتەكان كەوا هۆكاری سروشتین یاخۆد داستانن زۆر كەس ئەو ڕۆژانەش هەر بە حەوتەكان دادەنێن وەكو وەی (برایمی مەلای زێندینان) بە ساردترینی ڕۆژەكانی حەوتەكانی (بەندو بەندرخە) دەگوترێت




ئەو وێنەیە گۆی گەردوونی پیشان دەدات کەوا چۆن مجەرە کەلوویەکان لە دەرەوە بەگوێرەی هێڵی ئاسۆیی گەردوونی ئەوە وای کردووە شەش کەلوو لە وێنەکەدا بالۆ بە شەشەکەی تریش بکەونە باشووری هێڵی ئاسۆیی گەردوونییەوە بەڵام لە وێنەکەدا چوار کەلوو دیارنیە سەبارەت بە گۆییەکە

کەوا ئەو کابرایە پاڵەوانی داستانێکە بەناوی خۆیەوە[116] . یان بەفری پیرەژنێ و بورجی پیـرەژنێ و سەرمـای پیرەژنێ و زۆر جاریش ساردی عەجووزەی هەمووی هەر یەکن و بـە جیاواز دادەنرێن یانەخۆ لە رۆژژمێرەکانی ترەوە وەرگیراون و لە گەڵ حەوتەکانی خۆمانە ڕێـزیان دەکـەن . هەر وەهـا پەنگـرەکان (پشکووەکان) هەندێ جار بە حەوتەیان دەژمێرن ، بە هاتنی پەنگرەکان ئاڵ و گۆڕی بەسەر ئاوو هەوا دێت و خۆشی دەکات کەوا لە دوو حەوتەی (پیت و پالۆس) دا دەڵێن (پیت و پالۆز سال بوو ئالۆز) هەر لەو کاتەشە پەنگری هەوا دەکەوێت لە حەوتەی (پیت) و پەنگری ئاویش لە حەوتەی (پالۆز) دا . چونکە پەنگری هەوا لە یەکەم ڕۆژی مانگی ڕەشەمێیەوە حەوتەی (پیت) یش لە 27 ی ڕێبـەندان ـ 3 ی ڕەشـەمێیە ، پـەنگری ئـاو لە 8 ی ڕەشەمێ دەکەوێت و دەکەوێتە (پالۆز) لە 4 — تا 10 ی ڕەشەمێ بەوە دەرەکەوێت کەوا پەنگرەکان نـابێت حەوتـە بن بەڵكـو دەکەونە کاتی حەوتەکان . لە حەوتەی (خـدر) دا دەڵێن (کە هات خدر عارد دەبێ پەنگر پەیدا دەبێ کەنگر) ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ کە پـەنگری زەوی (عـارد) لە 15 ی ڕەشەمێ دا دەکەوێتە حەوتەی (خدر) کە لە 11 ـ تا 17 ی ڕەشەمێ یە هەر وەکو وتمان حەوتەکان لە شوێنێك بۆ شوێنێك دەگۆڕێن بەپێی ناو و ژمارەو بەرواروپاش و پێش کەوتنیان کەوا لە هەندێ ناوچە ژمارەیان (8) حەوتە یان (10) حەوتە یاخود زیاترە بەڵام بەگوێرەی ڕێکخستن و تەواوی کاتەکاندا و تێکڕایی ئاوو هەواوە ژمارەیان (10) حەوتەیە کە دوو (2) هەفتە بەسەر زستاندا تێپەڕی واتە لە 15 ی بەفرانبار هەندێ کەس لە (10 — 15) ی بەفرانبـار دەیان ژمێرن شایانی باسیشە ناوی حەوتەکان بە تەنیایی ناگوترێن بـەڵکو جـووت جووت بـەیەکـەوە دەوترێن و بـەو شێوەیـەی خوارەوە : ـ

## 1 — 2 — بێڵ و بێڵندە

**ـ بێڵ (15 — 21) ی بەفرانبار**

مانگی بەفرانبار یەکەمین مانگی زستانە بەفری لێ دەبارێت لە شوێنە جۆراو جۆرەکانی وڵاتەکـەماندا لە کەلێ شـوێن لەو کاتەدا بەفر زۆر لە سەر خانووەکان کۆ دەبێتەوە ئـەگەر بـە (بێڵەبەفر) ڕانەماڵدرێتـە خوارەوە شـۆڕنابێتـەوە ئەوەش بـە بێڵێکی تایبەتی دەبێ بۆ ئەو مەبەستە دروست کراوە . چونکە لەو ڕۆژانەدایە بەو کردارە هەڵ دەستن بە (بێڵ) بۆیە وا ناو نراوە حەوتەی (بێڵ) ، ئەو کاتەش سەرەتای دەست کردن بەو کارەیە تـا وەرزی بەفـربارین کـۆتایی دێت . ئـەو حەوتـەیە (بێدڵخە) شی[117] پێ دەڵێن لە وانەیە ئەو ناوە لە (بێڵدخـە) وە هاتبێت بەهەمان واتای (بێڵ) .

**ـ بێڵندە .(22 ـ تا 28) ی بەفرانبار :**

(بێرندە) شی پێ دەڵێن ئەو دوو ناوە یەکن بە (ڵ ـ ر) دا لە یەکتر جیاوازن (بێڵ + ندە ـ بێر + ندە) ، وە لە هەندێ ناوچەدا (ڵ) لامی قەڵەو دەگۆڕێنە (ر) ڕای لاواز[118] وەکو وەی (کۆڵان) دەبێتە (کۆران) بەو شێوەیـەش (بێڵ) بـووەتە (بـێر) ، واتە چاوگی هەردوو ناوەکان (بێڵ) ە ، ئەوە لە (بێـڵ + بەنـدە) بێڵبەندە داهاتووە بە کردتاندنی بە بۆ هاسانی زار ، لە کاتێکا حەوتەی ڕابووردوو (بێڵ) بوو واتای ئەو حەوتـەیەی بێـڵی لێ خراوە کار ، لەو حەوتەیەش دا کەش ساردتر دەبێت و بۆی هەیە لەبەر ساردی بێڵ و بەفرەکە ببـەستێ ئەگەر بێڵەکـە ماوەکی زۆرکەم بێ جووڵە بمێنێتەوە کەواتە بێڵەکە دەیبەستێت و بەند دەبێت . دەربارەی ناوی (بێرندە) مـامۆستـا کەریم شـارەزا بـەشێوەیـەکی درێژ بـاسی کـردووە کـەوا دەگـەڕێتـەوە بـۆ سەردەمێکی زوو کەوا جەژنێکی پیرۆزو پـڕپیت و بەرەکـەت بووە لەلای خێڵەکییە مەردارەکان و دەڵێ لە ووشەی (بێر) واتا مەڕدۆشینەوە هـاتووە ، ئیـدی چی لەوەی خۆشتـر هەیـە بۆ مەرداران کە مـەڕەکانیـان زاوزێ بکەن و بـەروو بوومی زۆر بێت[119] مامۆستـا زۆر بەشـارەزایی و ووردی باسی کـردووە ، بەڕوارەکەی خستۆتە (19) ی بەفرانبارەوە بەڵام لە سـەرەوە

باسمان کردووە کەوا لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر جیاوازی یان هەیە حەوتەکان دەربارەی ناوو ژمارەو بەروار3 — 4 — بەند و بەندرخە :

**ـ بەند (20 ـ ی بەفرانبار ـ 5 ی ڕێبەندان)**

بەند[120] لە بەند بوون یان داخرانەوە هاتووەو سەرەتای مانگی ڕێبەندانە لەو حەوتەیەڕا دەست پێدەکات ئیتر تا دووای ئەو مانگە لەبەر بەفر ڕێ بەند دەبێتو هاتو چۆ نامێنی .

**ـ بەندرخە (6 — 12) ی ڕێبەندان :**

(بەرخندە) یە خۆی (بندرخە)[121] مامۆستا زەبیحی دەڵێ هەفتەی شەشەمی زستانە بەحیسابی کوردەواری لە مەڵبەندی هەولێر دەکەوێتە نێوان (بەند) و (مێرەم) کەهەفتەی شەشەمی زستان بێت ئەوە دەکاتە هەفتەی چوارەمی حەوتەکان چونکە کە دوو هەفتە بەسەر زستان تێپەڕی ئەنجا حەوتەکان ژمێرە دەکرێن جا کە بەندرخە هەفتەی شەشەم بێت ئەوە (بەند) پێش ئەوەو هەفتەی پێنجەمی زستانو هەفتەی سێیەمی حەوتەکان دەبێت وە (مێرەم) یش لە دووای بەندرخەوە دێت کەواتە هەفتەی حەوتەمی زستانەو هەفتەی پێنجەمی حەوتەکان دەبێت .

(بەندرخە یان بندرخە لە (بەرخندە) وە هاتوونە بەجێ گۆڕکێی پیتەکان لە (بەرخ + بەندە) وە هاتووە (بەرخ بەندە) بە کرتاندنی بە بۆ هاسانی بوتە (بەرخندە) ، واتا لەوچەند ڕۆژەدا کەش تینی ساردایی زیاد دەکات ئەوەندە سارد دەبێتو کار لە مەڕوو مالات دەکات بە تایبەتی ئاژاڵی ئاووس لەوانەیە لەبەر ساردی زیان بە (بەرخ) ی ناوسکی دایکی بگەیەنێو ببێتە هۆی مردنی بەرخەکەو بەر هاویشتنی مەڕەکە ، واتە لەبەر ساردی بەرخ لە ناوسکی دایکی دەمرێت بۆیە بەر حەوتەیە دەڵێن بەرخندە یان بەندرخە ،

**5 — 6 —مێرەم ئۆغەن**

**ـ مێرەم (13 — 19) ی ڕێبەندان**

حەوتەی ڕابووردوو باسمان کرد مێرەم دەکەوێتە هەفتەی پێنجەمی حەوتەکان ، مامۆستا زەبیحی لەباسی ئۆغەنیش باسی دەکات[122] و دەکەوێتە هەفتەی حەوتەمی زستان واتەی هەفتەی پێنجەمی حەوتەکان ، لەچەند ڕۆژێکی ئەو ماوەیەدا کەش دەگۆڕێتو خۆش دەبێتو لە پڕێکەوە ساردیو ستەمی دایدەگرێتەوەو زریانو بۆرانو ڕەهێڵە هەندەی تر ساردی دەکاتو زۆر حەستەمو دژی دەکات لە یەکێك لە ڕۆژەکانی ئەو حەوتە یە ژنێکی (مێرەم) ناو دەچێتە کۆڵێ (جل شوشتن لەسەر کانی) ئەو کاتەی مێرەم چووە کەش خۆش بووە چاوەڕوانی ڕۆژێکی وا دژی نەکردووە بەڵام دووایی بەسەریدا دەبارێتو زریانو بۆران هەڵی کردووەو ڕێگەی گەڕانەوەی لێبڕاوە ، پاش گەڕانو سوڕان هیچ پەناو پەسیوەك نادۆزێتەوە کەوا خۆی تیا حەشار بدات لەتەڕ و ساردی ڕزگاری بێت تەنها ئەوە نەبێت تووشی کەلاکە (لاشە) ڕەشەوڵاغێك دەبێتو ووڕگی هەڵدەدڕێو دەچێتە ناوییەوەو ئیدی دووایی لە سەرمان لەناوی ڕەق دەبێتەوە بۆیە بەو حەوتەیە دەڵێن (حەوتەی مێرەمێ) چونکە کاتەکەی کەشی تیادا وەکو کەشی ئەو کاتە بووە کە (مێرەم) ی پێ چووە لە هەندێ شوێن پێی دەڵێن سەرمای پیرەژنێو یان هەریەکەیان بە حەوتەیەکی سەربەخۆیان دادەنین .

**ـ ئۆغەن (20 — 26) ی ڕێبەندان**

ئۆغەن ناوی هەفتەی هەشتەمی زستانە بەحیسابی کوردەواری لەناوچەی هەولێر دەکەوێتە نێوان (مەیرەم) و (پیت)[123] واتە هەفتەی شەشەمی حەوتەکانو مێرەم لە پێشی دادێت و پیت لەدووایی‌دا کەواتە (پیت) یش دەکەوێتە هەفتەی حەوتەمی حەوتەکانو (پالۆز) یش لەبەر ئەوەی لە دووای پیتەوە دێت دەکەوێتە هەفتەی هەشتەمی حەوتەکان . ئۆغەن حەوتەی شەشەمەو ناوی مێردی مێرەمێیە لە حەفتەی ڕابووردوودا کاتێ مێرەم دەچێتە کۆڵێ ئیدی ناگەڕێتەوە ئۆغەنیش کاتێ لەوحەوتەیە لە کاروان دەگەڕێتەوە کەوا ئاخرو ئۆخری مانگی ڕێبەندانێ یە کاروانچی دەرگایان لێ دەکرێتەوە کە دێتەوە بەو هەواڵە دەزانێت کەمێرەم مردووە . بۆیە دەڵێن



(مێرەم دەبینێ نۆغەن دەشکێنێ) واتا لە حەوتەی مێرەمێ ساردی و زەقیقەتی هەیە بەڵام حەوتەی دووای ئەو نۆغەنە ئەو ساردی و سڕی و زەقیقەتەی پێشتر نامینێ .

### 7 – 8 – پیت و پالۆس
### (پیت و پالۆز ساڵ بوو ئالۆز)

**– پیت 27 ی ڕێبەندان – 3 ی ڕەشەمێ**

هەفتەی نۆیەمینی زستانەو هەفتەی حەوتەمینی حەوتەکانە دەلێن (پیت ئەگەر لە خۆت نەڕیت بە کەرتێك دەبیت) یان (پیتێ پیت کرد ساڵێ فیت کرد) بەوا لەو ماوەیەدا ئیتر کەش خۆش دەبێت و ساردی و سڕی نامینێ ئەوەی کە تا ئێستا ڕزگاری بووبێ نەخۆشی و نارەحەتی ئەوە ڕزگاری بووو ساڵی تەواو فیت کردو ئەوەش کە تووش بوو ئەوە لە خۆی دەڕی واتە ئەوەی لە حەوتەکانی ڕابووردووی چلەی زستان نەخۆش کەوت ئەوە بەزی و لە خۆی ڕیت .




چەپیا بوونی ڕووەکانی هەیڤ و دەرکەوتنی بە گوێرەی بینەر لەسەر زەوی یەوە سەبارەت بە دانەوەی تیشکی خۆرە لەسەری. ئەو ڕووانەی هەیڤ کە واسپی یە ئەوە یە بەر تیشکی خۆر کەوتووە، هەمیشە هەیڤ وەکو زەوی نیوەی شەوە و نیوەی ڕۆژە. جا ئەو نیوەیەی کە ڕۆژە یا هەموو بلێین ڕووناکە ئەوە بەگوێرەی بینەر لەسەر زەوی و [illegible] کەم یا زۆر مان [illegible]

**– پالۆس (4 – 10) ی ڕەشەمێ .**
**پالۆز**

حەوتەی دووای پیتە واتە هەفتەی هەشتەمی حەوتەکان دەلێن (پاڵ دەپاڵێنی) یاخود (پالۆز ساڵی کرد ئالۆز) واتای گۆڕانی ئاوو هەواو خۆش بوونی کەش بە تەواوی لەو حەوتانەدا کە دەلێن (پیت و پالۆز ساڵ بوو ئالۆز) . هەروەها پەنگری (پشکووی) هەواو پەنگری ئاو یەك لە دووای یەکدا دەکەونە ئەو دوو حەوتەیە ، لە حەوتەی (خدر) یدا دەلێن (کە هات خدر عارد دەبێ پەنگر پەیدا دەبێ کەنگر) کاتێ پەنگری عارد یا زەوی لە حەوتەی خدری‌دا بێ لە (15) ی ڕەشەمێ ئەوە بێ‌گومان پەنگری ئاو (8) ی ڕەشەمێ لە پێشترە دەکەوێتە حەوتەی پالۆس کەواتە پەنگری هەوا (1) ی ڕەشەمێ دەکەوێتە حەوتەی پیت . بەپێی ژمێرەکردنی هەندێ کەس پەنگری (هەواو ئاو) ناکەونە (پیت و پالۆس) چونکە پیت و پالۆس بە هەفتەی حەوتەم هەشتەمی زستان دادەنێن نەوەك وهەفتەی حەوتەم و هەشتەمی حەوتەکان (مێرەم و نۆغەن) یش بە هەفتەی پێنجەم و شەشەمی زستان دادەنێن لە جیاتی هەفتەی پێنجەم و شەشەمی حەوتەکان ڕای مامۆستا زەبیحی‌یە کە دەڵێ نۆغەن هەفتەی هەشتەمی زستانە[124] وە کاتێك دەست بەو حەوتانە دەکرێت کە دوو هەفتە بەسەر زستانی ڕابوورد ئەو کاتە دەردەچێ نۆغەن هەفتەی شەشەمی حەوتەکان بێت ئەوانی تریش بەو شێوەیە هەرچەند هەفتەی زستان بوو دوو هەفتەی سەرەتای زستانی لێ دەرکەین هەفتەی حەوتەکان دەردەچێت

کە دەڵێ بەندرخە هەفتەی شەشەمی[125] زستانە دەبێتە هەفتەی چوارەمی حەوتەکان بەو جۆرە مێرەم حەوتەی پێنجەم نۆغەن حەوتەی شەشەم پیت حەوتەی حەوتەم پالۆس حەوتەی هەشتەم بەو جۆرە حەوتەکان تەواو لە دووای یەکترن تەنها چوار حەوتە ماوە کە لە گەلیان دا ڕیز بکرێت ئەوانیش (بێڵ و بێڵندە – خدر و ئەلیاس) ن کەوا هەر یەکەیان جێگایان دیارە چونکە بێڵ حەفتەی یەکەمی حەوتەکانەو دەکاتە هەفتەی سێیەمی زستان بێڵندەش لە دووای بێڵە دەکاتە هەفتەی دووەمی حەوتەکان و هەفتەی چوارەمی زستان . (خدر و ئەلیاس) یش حەوتەکانی کۆتایین کە دەلێن (خدر و ئەلیاس

سالیان کرد خلاس) کەواتە لە دووای پیت و پالوس دێن کەوا لە هەفتەکانی یازدەمین و دووازدەمینی زستان دەبن بۆیە دەبنە هەفتەی نۆیەمین و دەیەمینی حەوتەکان . جا لە کاتێکا پەنگری هەوا (1) ی ڕەشەمێ یە دەکەویتە پیت لە (27 /ی ڕێبەندان – 3 / ی ڕەشەمێ ، پەنگری ئاو (8) ی ڕەشەمێ یە دەکەوێتە پالوس لە (4 — 10) ی ڕەشەمێ هەروەها پەنگری زەوی (15) ی ڕەشەمێ دەکەوێتە خدری لە (11 — 17) ڕەشەمێ .

**9 — 10 خدر و ئەلیاس سالیان کرد خەلاس**

**– خدر (11 — 17) ی ڕەشەمێ**

هەفتەی پانزەمینی زستان و نۆیەمینی حەوتەکانە (خدر ... سال ما پتر) هەمیشە لە گەل ئەلیاس ناوی دێت کە وتمان جووت جووتن (خدر و ئەلیاس سال دەکەن خلاس) وەلەیەکەم ڕۆژی ئەو حەوتەیەدا بای وادە هەل دەکات و بەفر دەتوێنێتەوە ئیتر ساردی و سری نامینێ و مژدەی هاتنی نەورۆزە چونکە (18) ڕۆژی دەمینێ بۆ نەورۆز هەل دەکات[125]

**– ئەلیاس (18 — 24) ی ڕەشەمێ :**

هەفتەی دووازدەمینی زستان و هەفتەی دەیەمینی حەوتەکانە حەوتەی کۆتایی یە کە ووتمان لەگەل خدردا پێکەوەن لە هەفتەی رابووردوودا (خدر و ئەلیاس سالیان دەکرد خلاس) بەلام لێرەدا کەوا حەوتەی دووایی یەو ئیدی بە تەواوی (خدرو ئەلیاس سالیان کرد خلاس) بۆیە وا دەلێن چون حەزرەتی خدرو ئەلیاس فریای خەلك دەکەون لە کاتی تەنگانەدا ئاواش خەلك لە دەست سەرماو سوڵەی چلەی زستان ڕزگار دەکەن چونکە بە تەواوی تەنها شەش حەوتە دەکەونە بەر چلەی زستان ئەوانیش ئەوانەی (بەندو بەندرخە) (مێرەمو ئۆغەن) (پیت و پالوس) خدرو ئەلیاس خۆیان ناکەونە بەر چلەی زستان . کەوا ئەو دوو حەوتەی کۆتایی خدرو ئەلیاسن واتە لەو دوو حەوتەیەدا ئاوو هەوا خۆش دەبێت و کەش بەرەو گەرمی دەچێت کە بەرامبەرە لە گەل (9 — 15) ی ئازاردا[127] دەلێن (کەهات خدر عارد دەبێ پەنگر پەیدا دەبێ کەنگر) (کە هات ئەلیاس سەرما دەبێ خلاس) ، حەوتەی ئەلیاس لە (24) ی ڕەشەمێ کۆتایی دێت ئەو کاتە خولێکی سالی بەرەو تەواو بوون دەچێت . چەند ڕۆژێکی کەم دەمینێ بۆ خلاس بوون تاکو لە وەرگەڕانی بەهاری (21) ی ئازاردا خول نووی بێتەوەو سەرەتای سالی نووێ بە ڕۆژی نەوروز دووبارە دەست پێ بکاتەوە جا بۆیە دەلێن (کە هات ئەلیاس سال دەبێ خلاس) وە پێش ئەوەی بکەوینەوە نەوروز پێنج شەش ڕۆژ دەمینێ کە خور هەموو ڕۆژێ جێگەی ئاوا بوونی خۆی دەگۆڕێ بە بڕێکی زۆر بەو چەند ڕۆژەش دەلێن (بازەبەران) لەڕاستی یەکەیدا لە (بازبردن) وەرگیراوە واتا بازدان لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر[128] .

جا بە کۆتایی هاتنی بازەبەران لە (29) ی ڕەشەمێ یان (30) ی ڕەشەمێ[129] زەوی لە سووڕانی دەبێتەوە جارێکی تەواو بەدەوری خوردا و دووبارە خور دەچێتەوە کەلووی شەك لە کەلووی نەهەنگ ڕا کەوا ڕۆژی وەرگەڕان لە گەل شەوەکەی بەرامبەرەو هەر یەکەیان (12) کاژمێرە[130] . کەوا ڕۆژی نەوروزە (1) ی خاکەلێوە بەرامبەر (21) ی ئازار ئەنجا دەکەوینە سەر ڕۆژو سالێکی نووێ بۆ سالنامەو ڕۆژمێری کوردی لە — 1 — 1 — سالی کوردی .

منیش لێرەدا کۆتایی بە باسەکەم دەهێنم سەرەرای وەی زۆرم هەول داوە بەووردی بینووسم لەوانەشە لە هەلە دوور نەبێت چونکە زانیاری یەکانم لە دەمی خەلکەوە بیستووە بە تایبەتی لە ڕۆژ ژمێری یەکەدا زانیاری ئەوانیش هەموو وەکو یەك نەبووەوە نووسینی شتێك دەربارەی ئەو باسەشم دەست نەکەوتووە لە ڕۆژژمێری دا تەنها لە چەند شوێنێکی دوو فەرهەنگی کشتووکال و قامووسی زمانی کوردیدا دەربارەی ناوی مانگەکان و ژمارەی ڕیزەکان و ژمارەی ڕۆژەکانم دەست کەوتووە لە گەل هەندێ حەوتە کە مامۆستا زەبیحی لە قامووسی زمانی کوردی باسی کردوون لە کۆتایی دا هیوادارم توانیبیم کەمێك لەو بابەتەم ڕوون کردبێتەوەو لە باس کردن و لێ کۆڵینەوەم بێبەش نەکردبن و ئەو بابەتە فۆلکلۆری یەم لە فەوتان ڕزگار کردبێت کە ئەو کەلەپوورە بەنرخە لە دەست نەدەین کەوا چۆن باپیران لە دەستیان نەداوەو ئەو ئامانەتە پیرۆزەیان بە ئێمە گەیاندووە . یانە خۆ بە بیری هەندێ کەسی وام هێنابێتەوە کە لە نووسینی ئەو بابەتە شتێ دەزانن ، وە ئەوەی هەلەشە شەرمم لێ یە هیوادارم هەروا بە هەلەیی نەمینێتەوەو هەلەی تریش زیاد بکات بەلکو ڕاست بکرێتەوە بۆ بەرهەم هێنانی ڕۆژ ژمێرێکی کوردی و سالنامەیەکی تەواوی ڕێك و پێك .




| کوردی | عەرەبی |
| --- | --- |
| ساڵنامە | تقويم |
| ڕۆژژمێر | مفكرة |
| چەرخە | دورة |
| ڕۆژ | يوم |
| خۆر | شمس |
| هەیف | قمر |
| مانگ | شهر |
| هەتاوی | شمسي |
| وەرگەڕان | اعتدال |
| کەلو | برج |
| ئاماژ | اشارة |
| سیستەم | نظام |
| کوێرەوەری | جاهلية |
| ئەستێلك | سدة |
| ڕێژەیی | نسبي |
| یەکە | وحدة |
| سووڕانەوە | دوران |

| کوردی | عەرەبی |
| --- | --- |
| خول خواردن | لف ـ دوران |
| یان دوران | محوري |
| چغز | دائرة |
| ڕوو | وجه |
| کاژمێر | ساعة |
| خولەك | دقيقة |
| چرکە | ثانية |
| هەیڤی نوێ | هلال |
| نیوە تابان | محاق |
| تابان | بدر |
| تێکڕایی | معدل |
| ساڵی پڕ | كبيسي |
| وەرز | فصل |
| فەریك | سنبلة |
| پۆل | صنف |
| ئەستێرە | نجم |
| هەسارگە | كوكب |
| هەفتە | اسبوع |

| کوردی | عەرەبی |
| --- | --- |
| حەوتە | فقط (7) ايام |
| پەنگر ـ پشکو | جمرة |
| پەنگری هەوا | جمرة الهواء |
| پەنگری ئاو | جمرة الماء |
| پەنگری زەوی | جمرة الارض |
| کەلوەکان | الابراج |
| کەلووی شەك | برج الحمل |
| کەلووی گا | برج الثور |
| کەلووی جمك | برج الجوزاء |
| قرژڵ | سرطان |
| شێر | اسد |
| فەریك | عذراء ـ سنبلة |
| تەرازوو | ميزان |
| دووپشك | عقرب |
| کەوان | قوس |
| گیسك | جدي |
| دۆلچە | دلو |
| نەهەنگ | حوت |

68 — قامووسی زمانی کوردی مـەحەمـەد عبدالرحمن زەبیحی بەرگی 2 ل 222،221
69 — گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق بەرگی 7 ل 465
70 — قامووسی زمانی کوردی زەبیحی بەرگی 2 ل 202
هەروەها فەرهەنگی کشتوکاڵی مردۆخ بەرگی 1 ل 121
71 — گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق بەرگی 7 ل 322
72 — شۆڕشی کشتوکاڵ پاشکۆی کوردی ژمارە 2 ل 24 — 25
73 — قامووسی زمانی کوردی زەبیحی بەرگی 1 ل 10

74 — فـەرهەنگی کشتـوکاڵ مـەعـروف قـەرەداغی مـردۆخی بەرگی 1 ل 121
75 — قامووسی زمانی کوردی زەبیحی بەرگی 1 ل 11
76 — فـەرهەنگی کشتـوکاڵ مـەعـروف قـەرەداغی مـردۆخی بەرگی 2 ل 12
77 — قامووسی زمانی کوردی زەبیحی بەرگی 2 ل 59
78 — گۆڤاری شۆڕشی کشتوکاڵ پاشکۆی کوردی ژمارە 2 ل 25
79 — هەمان سەرچاوە ل 26

80 — قامووسی زمانی کوردی زەبیحی بەرگی 2 ل 59
81 — فەرهەنگی کشتوکاڵ مردۆخ بەرگی 2 ل 12
82 — گۆڤاری شۆڕشی کشتوکاڵ پاشکۆی کوردی ژمارە 14 ل 14
83 — قامووسی زمانی کوردی زەبیحی بەرگی 2 ل 19
هەروەها فەرهەنگی کشتوکاڵ مردۆخ بەرگی 1 ل 27
84 — 85 — فەرهەنگی کشتوکاڵ مردۆخ بەرگی 1 ل 42

86 — هەمان سەرچاوە بەرگی 1 ل 100
87 — گۆڤاری شۆڕشی کشتوکاڵ پاشکۆی کوردی ژمارە 2 ل 26
88 — هەمان سەرچاوە ژمارە 6 ل 37 — 38
89 — هەمان سەرچاوە ژمارە 2 ل 25
90 — قامووسی زمانی کوردی زەبیحی بەرگی 2 ل 140
91 — گۆڤاری شۆڕشی کشتوکاڵ پاشکۆی کوردی ژمارە 14 ل 14

92 — 93 — فەرهەنگی کشتوکاڵ مردۆخ بەرگی 2 ل 143
94 — هەمان سەرچاوە بەرگی 2 ل 12
95 — هەمای سەرچاوە بەرگی 1 ل 128
96 — هەمان سەرچاوە بەرگی 2 ل 143
97 — گۆڤاری شۆڕشی کشتوکاڵ پاشکۆی کوردی ژمارە 2 ل 26
98 — فەرهەنگی کشتوکاڵ مردۆخ بەرگی 2 ل 143
99 — گۆڤاری (العلم و الحیاة) بغداد ژمارە 4 ل 37
100 — فەرهەنگی کشتوکاڵ مردۆخ بەرگی 2 ل 72
101 — گۆڤاری (العلم و الحیاة) بغداد ژمارە 11 ل 11
102 — فەرهەنگی کشتوکاڵ مردۆخ بەرگی 1 ل 60
103 — هەمان سەرچاوە بەرگی 1 ل 155
104 — هەمان سەرچاوە بەرگی 1 ل 60
105 — هەمان سەرچاوە بەرگی 2 ل 71
106 — هەمان سەرچاوە بەرگی 1 ل 184
107 — گۆڤاری شۆڕشی کشتوکاڵ پاشکۆی کوردی ژمارە 14 ل 14
108 — فەرهەنگی کشتوکاڵ مردۆخ بەرگی 1 ل 60
109 — قامووسی زمانی کوردی زەبیحی بەرگی 2 ل 202
110 — هەمان سەرچاوە بەرگی 2 ل 224
111 — هەمان سەرچاوە بەرگی 1 ل 208
112 — فەرهەنگی کشتوکاڵ مردۆخ بەرگی 1 ل 156
113 — گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق بەرگی 7 ل 392
114 — فەرهەنگی کشتوکاڵ مردۆخ بەرگی 1 ل 107 — 108
115 — گـۆڤـاری شـۆڕشی کشتـوکـاڵ پـاشکـۆی کـوردی ژمارە 14 ل 17
116 — تحفة المظفرية ئۆسکارمان ـ هێمن بەرگی یەکەم برایمۆك ل 99
117 — گۆڤاری بەیان ژمارە 57 ل 81
118 — گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی 5 ل 264
119 — گۆڤاری بەیان ژمارە 57 ل 81
120 — 121 — قـامـووسی زمـانی کـوردی زەبیـحی بـەرگی 2 ل 103
122 — 123 — 124 — هەمان سەرچاوە بەرگی 1 ل 115
125 — هەمان سەرچاوە بەرگی 2 ل 103
126 — هەمان سەرچاوە بەرگی 2 ل 8
127 — گۆڤاری شۆڕشی کشتوکاڵ پاشکۆی کوردی ژمارە 2 ل 24
128 — قامووسی زمانی کوردی زەبیحی بەرگی 2 ل 35
129 — هەمان سەرچاوە بەرگی 1 ل 208
130 — گـۆڤـاری (الزمـن) سـلسـة کـیـف و لمـاذا (بیروت) ل 47

# کـاروانـی ڕۆشـنـبـیـری لەکوردسـتـاندا

## لـە هــەولــێــر

ئامادەکردنی : شوان

○

### شانۆگەری « ژانی گوندەکەمان » .

تیپی نواندنی « کرمانج » ی مەڵبەندی لاوانی کووڕانی سەر بە ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشنبیریو لاوان ، ڕۆژانی—2—3—4 کانوونی دووەمی ساڵی 1984 شانۆگەری « ژانی گوندەکەمان » ی پێشکەش کرد .

تیپی نواندنی « کرمانج » کۆمەڵێ لاوی تازە پێگەیشتووی خوێن گەرم هاوبەشی تێدا دەکەن ، شەوقو عەشقو خۆسوتانیان بۆ شانۆ نیشانەی داهاتێکی ڕووناك دەگەیەنێ ... نوبەرەی بەرهەمیان شوێنەواری گیانی بەهرەوەری پێوە دیارە .

« کارە هونەری یەکان »

سەبارەت بەدابەشکردنی کاری هونەری شانۆگەری یەکە بەم جۆرە بوو :

| | |
|---|---|
| بەڕێوەبەری بەرهەم | عەبدولکەریم عەزیز |
| بەڕێوەبەری شانۆ | یوسف صاڵح |
| دیکۆر | ئەکتەرەکان |
| ڕووناکی | تەحسین عەلی |
| جل وبەرگ | ئەکتەرەکان |
| مۆسیقا | گەیلان خدر |
| سەرپەرشتی شانۆ | صادق ، عوسمان ، عەبدولخالق |
| ئارایشت | تەحسین عەلی |

شایانی باسە ؛ شانۆگەری ـ ژانی گوندەکەمان ـ شانۆگەری یەکی خۆماڵی یە ؛ لەنووسینو دەرهێنانی : ( سەعدی عەلی ) یە .

ئەو ئەکتەرانەی بەپێی دەورەکانیان دەرکەوتوون بەمجۆرەیە :

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| غازی صابر | عەلە | | | | |
| کەمال صابر | عوسە شەل | پووشوو خدر | یاسین | ئەحمەد عەباس | قالە |
| عەبدولصەمەد عومەر | میرخان | جەعفەر عەزیز | سۆفی عەولا | کاکە جەلال | سەرکار |
| گەیلان پیربال | سیامەند | دلشاد عەبدولرحمان | ڕەسول | فەرهاد حسین | کوێخا |
| محەمەد عومەر | مەلا | ئیبراهیم قادر | سیروان | ئەحمەد محەمەد | شمشال ژەن |
| عەبدولکەریم عەزیز | خدر | کامەران عەلی | بەختیار | دلشاد ئەکرەم | ئەختیار |
| جەوهەر ئەنوەر | ئاورحمان | ئەرسەلان صابر | حاجی تەها | عەبدولرحمان مەعروف | دوکتۆر |

## « ژانی گوندەکەمان »

شانۆگەریی ژانی گوندەکەمان وەك بابەتێکی خۆماڵی ، باس لەکێشەیەکی هەڵقوڵاوی ناو کۆمەڵگاکەمان دەکات ، بەشێوەیەکی ساکارو ڕوون لایەنێکی ئەو دەردە کوشندەیەی دەردەخست کەکۆمەڵگای لادێ پێوەی دەناڵێنێ .. لەسەرەتادا خەڵکی گوندەکە قسەیان یەك نییەو پەرتو بڵاون ، هەریەکەیان لە ئاشێك دەدوێن و هیچیشی پاك ناکەنەوە .. دیاردەی زەوتکردنی ماڵی یەکدی ؛ ناوەخنێکی زەقی شانۆگەرییەکەیە .. ئەودەردە زەیف دەسەنێ و تەنانەت کار بەجۆرێکی نالەبار دەشکێتەوەو کتێبی ماڵان بەتاڵان دەبرێ ... کتێب دزین واتایەکی فراوان دەگەیەنێ و نیشانەی دیاردەیەکی سەختو سامناك دەبەخشێ ئەوەتا مشتو مڕ لەنێوان (سۆفی و سیروان ) دا ڕوو دەدات :

سۆفی : ئەوجا ئەوکتێبە شەیتانییانە چینە با هەربدزرێن .

سیروان : سۆفی عەولا ، گوێت لێبێ : مەسەلە کتێبی شەیتانی نییە ، دزی کتێب مانای ئابڕوو بردنە ، مانای ئەوەیە غەدرتان لێدەکەن .

دیارە کتێب دزین تەنیا واتای غەدرکردن ناگەیەنێ بەڵکو سنووری واتا بەخشینی فراوانتر دەبێتو دزی زادەی بەرهەمی بیرو زانست دەگەیەنێ .

[ کە پەتا زیاتر دەتەنێتەوە ]

بەڵێ کاتێ کێشەو ململانێ توندو تیژ دەبێتو مل ڕووەو لوتکە دەنێت ، تەمەنی کورت دەبێتەوەو ڕوو لەگەرووی مەرگ دەکات .

ئەوەتا دوای ئەوەی دیاردەی نامۆو دەردی ناهەموار لە گوندەکەدا دەتەنێتەوە ژانەکە بەسوێتر دەبێتو خەڵکەکە ڕوو لەیەك دەکەن چارە سەرێك بدۆزنەوە تا بە سەرکێشەکەدا زاڵ بن ، دیارە ئەو ڕوو لەیەککردنەو هانابردنە بۆ هۆشو بیرکردنەوەی قووڵو ورد هەر لە خۆوە نایەتەدی ، بەڵکو پێویستی بەگەلێ کۆڵەکەی بەهێزو بنەمای پتەو هەیە ... لای خەڵکی گوندەکە خۆشەویستیو شەیدا بوونو عەشقی خاكو خۆڵ هۆیەکی گەورەو پاڵپێوە نەرێکی لەوزە بەدەرە کە ڕەگی توندو تۆڵی بەناخیاندا داکوتاوە . داوای یەکگرتنیان لێدەکات ، تا چارێك بۆ ئابڕوو نەچوونی خۆیانو لەدەست نەدانی گوندە



کەیان بدۆزنەوە .. لەمشتو مڕی نێوان (ڕەسولو سیروان) دا کشتەکی مەبەستمان چنگ دەکەوێت .

ڕەسول : ئێ چارە باوکەکەم ؟

سیروان : چارە یەکگرتنە ، یەك دەستییە ، نەیەڵین کەس نزیکی مارو مندار وژیانمان بێ ، پێویستە لەوڕۆ بەدواوە لە هەرچوارلای گوندی پاسەوان دانێین بەتایبەتی شەوێ . خۆ ئەگەر دزەکان لەدەرەوەبن ، ئەوا لاشەکی ساردو سوڕی بۆ داكو بابیان دەنێرینەوە ... هەتا ئەوانەی دەیانەوێ پەرەگەندەمان بکەن ، ئەمە پەرگەندەیان بکەین ] .

ئەوڕایەی سیروان تا ئاستو ئەندازەیەکی چاك شوێنی خۆی گرتو لەیەکەم هەنگاویاندا پەنایان بردە بەر عەقلو جۆری بیرکردنەوەی خۆیان ، لەسەرەتادا بەگومان بۆیان دەرکەوت کە ماڵ زەوت کردن تەنیاپیشەی زاڵمو ستەمکارە و بازی قسەو بۆچوونیان بەسەر تەوقی سەری کوێخادا گیرسایەوە تا لەئەنجامی ئێشكو چاودێری کردنێکی هوشیارانەدا دزەکانیان گرت کەلەدواییدا دەرکەوت سەر بە کوێخا بوون ...

### (ئەنجام)

شەوێکی تاریکی ئەنگوستەچاوی سەخت ، دزەکان بەوشتانەی زەوتیان کردبوو کەوتنە کەمینەوە ، کونەمشکیان لێبوو بەقەیسەریو لای تێکڕای خەڵکی گوندە کە ئاشکرا بوون ... دزەکان لە ئەنجامی کۆمەكو هاوکاریو یەکگرتنی دانیشتووانی گوندەکەوە گیرانو پەچە لەڕوویان هەماڵدرا .

بەڵێ بەو جۆرە ئاکامێکی بەرزو پیرۆز لە ناوەڕۆکی شانۆگەریی ژانی گوندەکەمانەوە هەڵهێنجراو سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێنا

**تێبینییەکی بچووك** یەکێ لەو دەلاقە گەورانەی لەڕووی زمانەوە هەست پێدەکرا ، گەلێ جار نەك هەرتەنیا شێوە دیالێکتی زمانی کوردی بەکار نەدەهێنرا ، بەڵکو شێوە گۆڤەری ناوچەیەك بەکار دەهێنرا . بەنموونە وشەکانی [ مندارانە ، هەتیم ، دەخێنن ، خەرکینە ، نارێم ... ] کە باشتر وابوو لەپێناوی خزمەتکردنی زمانی یەکگرتووی کوردیدا پەیڕەوی بەکارهێنانی زمانی ستانداردی کوردی بکرێت .

## « چالاکی‌یه‌کی کۆلیژی ئاداب »

[ کۆڕێکی ئەدەبی لەئاهەنگی یەکتر ناسیندا ]

کێمان هەیە یادگارە ساکارو بێگەردەکانی سەردەمی منالی ی خۆی بەهەموو تالی‌و شیرینی‌یەکی‌یەوە لەبیر نەمابێت ؟ ئاخۆ هەر لەو تەمەنەی سەرەتای ژیانی مرۆڤدا یادگارەکان هەروا سووك‌و ئاسان لەتەختەی مێشکدا نامێنێ یان جۆرە ڕووداوو بەسەرهاتێك هەن هەرگیز نەخشە هەلکەنراوەکانیان لەتەختەی بیرەوەریدا ناسڕێتەوە ؟.

## « تابلۆی بیرەوەری‌یە نەمرەکان »

یەکێ لەو یادانەی هەمیشە لەگەل مرۆڤدا دەژی ، ژیانی پلەو قوناغی قوتابێتی‌یە ، بەتایبەت لەپلەو قوناغی خوێندنی زانکۆدا .

بەلێ وەك داب‌و نەریتێکی باو هەموو سالێك کۆمەلێ ئاهەنگی گۆرانی‌و مۆسیقاو کۆڕی ئەدەبی‌و ڕۆشنبیری لەکۆلیژەکانی سەر بەزانکۆی (صلاح الدین) دا ساز دەکرێت‌و بێ‌بەپێ ی بەرنامەیەکی هەمە جۆر گەلێ چالاکی ی هەمەڕەنگ پێشکەش دەکرێت کە بریتی‌یە لە بەرنامەی پەندوقسەی نەستەق‌و خوێندنەوەی پارچەو کۆپلە شیعری نایاب‌و بەرز کە ئاهەنگێکی سیحراوی لەدل‌و دەروونی ئامادەبواندا بەرپا دەکات بەجۆرێ سەرمەستی شادی‌و کامەرانی‌بن .

گەلێ جار ئەو ئاهەنگی یەکتر ناسینە بەجۆرێکی ئەوتۆ دەشکێتەوەو سەرتاپای خۆی لە کۆڕێکی چڕو پڕی ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی‌دا خۆی دەنوێنێ‌و چەندین دیاردەی گرنگی مێژوویی‌و ئەدەبی بەجێ دێلێ کە فەرامۆش کردن‌و پشت گوێ خستنیان زیان لە ژیانی ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی گەلەکەمان دەدات .

هەر لە ڕوانگەی ئەو بۆ چوونەوە ، بەشەوقەوە ڕوو لەئاهەنگی یەکتر ناسینی ئەمسالی کۆلیژی ئادابی سەر بەزانکۆی (صلاح الدین) کرا .

کۆلیژی ئاداب ئێوارەی ڕۆژی 25 / 12 / 1983 لەهۆلی ڕۆشنبیری جەماوەری لەهەولێر بەبۆنەی سالی تازەی خوێندن‌و یەکتر ناسینی قوتابیانەوە ئاهەنگێکی قەشەنگی ساز کرد .

سەرەتا عەمیدی کۆلیژ دکتۆر ئیسماعیل لازم هاشل بەناوی کۆلیژی ئادابەوە بەخێرهاتنێکی گەرم‌و گوڕی میوان‌و ئامادەبووانی کردو ئاواتە خوازی‌ی خۆی دەربڕی کە هیوادارە قوتابی‌یەکانی کۆلیژی ئاداب لەپلەی خوێندنی زانکۆیاندا بەچاکی سەرکەون‌و بەکەیفەوە ڕوو لەدنیای بەربلاوی زانست‌و ئەدەب بکەن .

دوا بەدوای ئەو وتارە کۆمەلێ ئاهەنگی بەجۆش‌و گۆرانی بەسۆزو هەلپەڕکێ ی کوردی پێشکەش کراو ناو بەناویش قوتابی (صباح چێچو) کۆپلە شیعری دلداری‌ی پێشکەش دەکرد .

شایانی باسە لەتەك ئەو چالاکی‌یانەدا شاعیری ناسراو مامۆستا کامەران مووکری ڕووی دیوێکی ئاهەنگەکەی بۆ کۆڕێکی ئەدەبی بەپێزو چڕ وەرگێڕا .

هاوبەشی مامۆستا کامەران مووکری‌و ئامادەبوونی لەسەر شانۆکە ، کۆڕێکی خنجیلانەی ئەدەبی پێك هێناو قوتابی (ڕێزان کەمال) لەشێوەی گفت‌و گۆدا زۆر بەڕێزەوە کۆمەلێ پرسیاری ڕوو بەڕوو کردەوە ... وەلامەکانی شاعیری ناسراومان بەم جۆرە بوو :

* ناوم حەمەی ئەحمەدی تەهایە .
* سالی 1927 لەگەڕەکی دەرگەزێن لەشاری سلێمانی لە دایك بووم .
* ئەلێن شاعیرم !.
* لەڕووی ناوەڕوکی شیعری‌یەوە حاجی قادری کۆیی زۆر بەتوندی کاری تێ‌کردووم .

ئێنجا ئەم کۆپلە شیعری‌یەی حاجی خوێندەوە :

**حاکمی ڕێ‌گری معمورەیە ، قاضی‌ی دزی ڕۆژ**
**وکلاو وزەرا گورگن ، ڕەعیەت گەلەیە**
**زانی‌ی‌و شارب ، لوتی دەگرن والی دەلێ :**
**پارەی خوداگە ، بەری دەن چ عەیبێکی هەیە .**

* کام شاعیری کورد کاری تێ‌کردوویت ؟ .
* شیعری ئەم شاعیرانە کاریان تێ کردووم‌و خۆم بە قوتابیان دەزانم : [ مەحوی ، بێکەس ، حاجی قادر ، زێوەر ] .. لەشیعری هەر شاعیرەیان ئەم کۆپلە شیعرانەی پێشکەش کرد :

**لە (شیعری مەحوی)**

**لە سەیری خەستەخانەی عیشق ئەو سەوزەی کەواشینە**

لەسەر هەر خەستەدێ یاخوێندنی یاسینە یاشینە
شەهیدی غەمزەیە بەعضێ ، سەقیمی عیشوەیە جەمعێ
دیارە سەر نویشتی ئەهلی دڵ یاشینە یاسینە

لە (شیعری قانع)

ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندیخانەیە
ئەم کەلەبچە ، مەرهەمی زامی دڵی دێوانەیە
گەرچی دوژمن وا ئەزانێ من بەدیلی لاڵ ئەبم
باش بزانێ : کونجی زیندانم قوتابی خانەیە

کامەران موکری سەبارەت بەبێکەسی شاعیر وتی : بێکەسی ئازاو نەترس روو بەرووی ئینگلیزی داگیرکەر وەستاو پەنجەی بەچاوی ئەدمونسا کردو ، لەبەر دەمیدا شیعری (بیست و حەوت ساڵە) ی خوێندەوە کەتێدا دەڵێ :

بیست و حەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم
بە نان و ئاو و جلو بەرگی خۆم
خزمەتم کردی لەئێران و ڕۆم
لەپێناوی تۆ شکاوە ئەژنۆم
کەچی هێشتا هەر دیل و ڕەنجەڕۆم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم ؟!.
بۆچی بەناهەق وا سووکت کردم ؟!

دوا بەدوای ئەوە قوتابی (ڕێزان کەمال) داوای لەمامۆستا کامەران کرد پارچە شیعرێکی نوێی خۆی پێشکەش بکات :

مامۆستای شاعیر دڵی ئامادە بووانی نەڕەنجان و ئەم کۆپلەیەی پێشکەش کردن :

کچەکە خۆشت بوێم یاخود نەوێم خۆشم ئەوێت
هۆشت لامبێ یانەبێ من عەشقی بێ هۆشم ئەوێت
چاوت لێمبێ یانەبێ ورشەی نیگای چاوم ئەوێت
رووت لەمن بێ یانەبێ ، ئەگریجەیی خاوم ئەوێت

بەڵێ کۆرە خنجیلانە نایابەکەی مامۆستا کامەران موکری بایەخێکی تایبەتی خۆی هەبوو ، شوێنی و مەنزڵی لە چالاکی یە ئەدەبی یەکانی ئەمرۆی ژیانی میللەتەکەماندا هەیە .

---

# لە سلێمانی

«ئاسۆس» ئامادەی کردووە

### کۆڕێ دەربارەی بەرنامەکانی تەلەفزیۆنی کەرکوک

ڕۆژی 1984/1/14 لە هۆڵی نامەخانەی گشتی لە سلێمانی بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر کۆڕێکی بۆ هونەرمەندان ساز کرد سەبارەت بە لێدوان دەربارەی بەرنامەکانی بەشی کوردی لە تەلەفزیۆنی کەرکوکا . لەم کۆڕەدا لێپرسراوان و کارگێرانی تەلەفزیۆن ئامادەبوون . لە ئەنجامی گفتوگۆی هونەرمەندەکان و ئەو پێشنیازانەی پێشکەشیان کرد یاداشتێکیان پێشکەش بە بەڕێوەبەری تەلەفزیۆن کرد تیایا دواکە وتوویی ئەم دەسگا گرنگەیان دەرخست ، هەروەها پەنجەیان بۆ ئەو هۆیانە ڕاکێشا کە بوونەتە کۆسپ لە ڕێگای نزیک بوونەوەی ئەدیبان و هونەرمەندان ، پێشنیازەکانی هونەرمەندان بریتی بوون لەم خاڵانەی خوارەوە :

1 - بەڕێوەبەرێتی تەلەفزیۆنی کرکوك لەڕووی پەیوەندییەوە سەر بە ئەمیندارێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان بێت .
2 - وەك بەڕێوەبەرێتی تەلەفزیۆنی بەغدا پێویستە بەشی تایبەتی بۆ نواندن و هەمە ڕەنگو ڕۆشنبیری و ژمێریاری بکرێتەوە .
3 - لیژنەیەکی باڵای ڕاوێژکاری لە ڕۆشنبیرو ئەدیب و هونەرمەندە کارامەکان پێك بێت شان بەشان نوێنەرانی بەڕێوەبەرێتی تەلەفزیۆن نەخشەی بەرمانەکان بۆ ماوەی دوورونزیك بکێشن .



4 ـ بۆ ئەوەی بتوانی مەبەستەکانی بەدی بهێنێ پێویستی بە بووجەیەکی تایبەتی هەیە .

5 ـ تەلەفزیۆنی کەرکوك پێویستی بەکارگێری هونەری هەیە ، بەومەرجەی کوردبن تا لەبواری دەرهێنان و وێنەگرتنا کاربکەن لێرەدا وای بەباش دەزانین کە دەورەی تایبەتی لە ـ پەیمانگای ڕاهێنانی ڕادیۆو تەلەفزیۆن لە بەغداد ـ بکرێتەوە بۆ ڕاهێنانی ئەو هونەرمەندانەی تیپەکانیان ئەیان پاڵێون .

6 ـ تا کارگێری کارامەمان دەبێت واچاکە لە تەلەفزیۆنی بەغداوە چەند دەرهێنەرێك بۆ ئەم مەبەسە بەشێوەیەکی کاتی تنسیب بکرێن .

7 ـ لیژنەیەکی هونەریی پسپۆر لە مۆسیقا زانە کوردەکان پێك بهێنرێت بۆ هەڵبژاردنی ئاوازو گۆرانی کوردی باش تا تۆمار بکرێن هەروەها لیژنەیەکیش بۆ تەتەڵەکردنی ووشەکانی گۆرانیەکان تا بزانرێ کامەیان لەڕووی کۆمەلایەتی و پەروەردەییەوە بۆ تۆمارکردن و بلاوکردنەوە دەست ئەدەن .

8 ـ ماوە خۆش بکرێ لەبەردەم بلاوکردنەوەی ئەو بەرهەمە هونەرییانەی کە لە میهرەجانی یەکەمی هونەردا لە ئازاری 1974 دا تۆمارکرا هەروەها بەر بەرەڵلا بکرێ بۆ ئەو چیرۆکە تەمسیلی و چالاکییە هونەرییانەی تر کە لە کاتی خۆیدا لەلایەن تیپە هونەرییەکانەوە تۆمار کراون .

9 ـ تەلەفزیۆن بە شێوەیەك بەهێز بکرێت کە هەموو ناوچەکانی کوردستان سوودی لێوەربگرن .

10 ـ ئەم بەرنامانەی خوارەوە پێشکەش بکرێت

أ ـ بەرنامەی منالان .

ب ـ بەرنامەیەکی ئەدەبی بەسەرپەرشتی یەکێتیی نووسەرانی کورد .

ج ـ بەرنامەی (هونەری کوردی) بەسەرپەرشتی هونەرمەندانی کورد .

د ـ بەرنامەی ـ مێژوو سامانی نەتەوەیی کوردی ـ .

هـ ـ بەرنامەی وەرزش و لاوان .

و ـ چەند بەرنامەیەکی هەمەجۆری تری ڕۆشنبیری و زانیاری .

11 ـ بۆ ئەوەی منالانی کورد لەو فلیمە کارتۆنانە بگەن کە لە تەلەفزیۆنا پیشان ئەدرێن با بەکوردی دۆبلاج بکرێن .

12 ـ زۆر پێویستە لیژنەی چاودێری دەقە تەمسیلییەکان لە هونەرمەندە کوردە شارەزاکان پێك بێت وەپاش ڕێپێدانی دەقەکە ئیتر پێویست بە مەرجی تری لاوەکی ناکات .

13 ـ لەکاتی تۆمارکردنی بەرهەمی هونەرمەندانا پێویستە بارودۆخێکی باشیان بۆ برەخسێنرێ .

14 ـ سەرژمێرێکی ئەو بەرهەمە تۆمارکراوانەی لەوەوپێش بکرێت بۆ جیاکردنەوەی ئەو بەرهەمانەی بەکەڵك نایەن و لە لایەن لیژنەیەکی هونەرییەوە بڕیاری فەوتاندنیان بدرێت .

15 ـ هەندێ گۆرانێ بێژی لاو هەن کەسەر بە ڕێکخراوەکانن زۆر پێویستە بەرهەمەکانیان لە بەرنامە تایبەتییەکانی لاوان و قوتابیانا یان لەبەرنامەی ئارەزوو مەندانا بلاوبکرێنەوە نەك لەبەرنامەی گشتی ڕۆژانەدا .

16 ـ پێویستە لە دامەزراندنی موزیعەکانا مەسەلەی زمان رەچاوبکرێت ، باشتر وایە کە لیژنەی هەڵبژاردن زمانەوانی پسپۆری تێدابێ .

17 ـ ئەو پاداشتانەی بۆ بەرهەمە کوردیەکان دائەنرێن پێویستە بەپێی ئەو لائحانە بێت کە لە تەلەفزیۆنی بەغدادا بەکاردەهێنرێ .

18 ـ هونەرمەندان و ئەو تیپانەی بەرهەم تۆمار دەکەن سەرەرای پاداشتەکەیان دەبێ مەسرەفی هاتوچۆیان بکیشرێ .

19 ـ ناوبەناو ئەو تەمسیلە کوردییە سەرکەوتوانەی سەرنج ڕادەکێشن بەرچڤەی عەرەبی بخرێتە سەرو لە تەلەفزیۆنی بەغداوە بلاوبکرێنەوە .

20 ـ ڕاستەوخۆ بەهۆی کامێرای تایبەتییەوە شانۆنامە کوردییە باشەکان تۆمار بکرێن بۆ ئەوەی وەك شانۆنامەیەکی تەلەفزیۆنی پیشان بدرێت .

21 ـ ئەو شانۆنامە جیهانییانەو ئاهەنگە مۆسیقیە جیهانیەکانی بەرنامەی دووەم لەبەشە کوردیەکەدا پیشان بدرێن .

22 ـ ئەو بەرهەمە هونەرییە باشانەی کە لەوەوپێش بەرەش و سپی تۆمارکراون سەرلەنوێ بە ڕەنگاورەنگ تۆمار بکرێن .

